# فەرهەنگی سۆفیا

نووسینی: ئۆتە بیوهمە
وەرگێڕانی لە دانیمارکیەوە: بەهرۆز حەسەن
بابەت: فەرهەنگ
تیراژ: 700 دانە
ژمارەی سپاردن: 317 ی 2003
زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
کتێبی گیرفانی ژمارە 40
سەرپەرشتیاری گشتی زنجیرە: ئازاد بەرزنجی

### ئارکیمیدز Archimedes

ئارکیمیدز "نزیکەی 287 بۆ 212 ی پێش مەسیح" بە گرنگترین زانای ماتماتیکی سەدەی کۆن دادەنرێت. پێدەچێت خۆشی لەو بڕوایەدابووبێت، چونکە ئەم بەلایەنی کەمەوە لەو جۆرە پیاوانە نەبوو کە گرفتی خۆبەکەمزانینی هەبووبێت. ئەو دەیگوت؛ "خاڵێکی نەگۆڕم بدەرێ، تا من جیهانت بۆ بلەرزێنمەوە"، لێرەدا تەنها گوزارش لە شانازیکردنێکی قەشەنگ ناکات بەخۆیەوە، بەڵکو ئاماژە بۆ "خاڵیکی ئارکیمیدزی"ش دەکات (دواتر خاڵی ئارکیمیدزی بوو بە دەربڕینێکی سەربەخۆ). مەبەستەکە لەوەدایە کە لە ڕێگەی بینینێکی ڕوونەوە بتوانیت ڕێگاچارەی گرفتێک بدۆزیتەوە. ئارکیمیدز لەلای هایرۆن پاشای ستەمکار کاریدەکرد و جگە لەوەش وەک داهێنەرێکی بلیمەت ناوبانگی دەرکردبوو؛ چەندین ئامێری بەسوودی داهێنا، بۆ نمونە ئەو بۆ یەکەمین جار ئامێری شت بەرزکردنەوەی داهێنا کە لە خلخلۆکە و پەت پێکهاتبوو، هەروەها داهێنانی بەلوعەی ئاگرکوژاندنەوەی کۆڵانەکان و زەرەبینیش بەناوی ئەمەوە لکاوە.

(ئارکیمیدز زانایەکی هیللینیسکی بوو... جیهانی سۆفیا، لا.330)

### ئاریستیپۆس Aristippos

فەیلەسوفێکی پڕ لە نهێنیە، هیچ سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراومان سەبارەت بە کاتی ژیانی نییە... (*هێندەی من ئاگاداربم لە هەندێ سەرچاوەدا سەردەمی ژیانی دەگەڕێننەوە بۆ نێوان ساڵەکانی 435 بۆ 366ی پێش مەسیح، و) بەڵام لەگەڵئەوەشدا حیکمەتێک بەناوی ئەمەوە نووسراوەتەوە کە بۆ هەتاهەتایە خەڵکانێک دەبن بڕوای پێبکەن و دوای بکەون، ئەو دەیگوت؛ تەنها ئێستاکە گرنگە، بەر لە هەمووشتێکیش ئەو ساتانەی کە هەستی خۆشیمان پێدەبەخشن و نرخی تایبەتیان بۆدادەنێین.

(بەڵام سوکرات قوتابیەکی تریشی هەبوو کە ناوی ئاریستیپۆس بوو... جیهانی سۆفیا، لا 143)

### ئاگایی

بێگومان کێشەی ئاگایی کۆنترین گرفتی فەلسەفی نەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پرسیارێکە بەردەوام ناتەبایی دەخوڵقێنێت، چونکە وەڵامدانەوەی پرسیاری ئاگایی، هەڵوێست و بۆچوونێکی گرنگ و بنچینەیی دەخوازێت؛ من چۆن جیهان دەبینم، چۆنچۆنی خۆم دەبینم ـ لە کاتێکدا ئەو ناوەندەی، کە لە ڕێگەیەوە زانیاری دەربارەی خۆمان و جیهانی لێوە هەڵدەهێنجێنین، بێ قەیدوشەرت دەبێت تەنها ئاگایی بێت، ئاگاییش وەک هەموو بەشەکانی تری لەشمان، بەشێکە لە ئێمە، بەڵام بە پێچەوانەی هەستە لەشیەکانمانەوە توانای گەشەکردنی لەناوەوەدایە ـ ئەم توانایەش دەمانگەیەنێتە شتێک کە ئەمرۆکە پێیدەگوترێت "خۆ دۆزینەوە". ئاگایی هەمیشە بەئاگایە لە شتێک، ئەمەش لەلایەک بە ئاگابوون لە خود و لەلایەکی تریشەوە هەستکردنیش بە خود دەگرێتەوە، کە ناچارانە دەبێت بە پڕ نهێنیترین لایەنی ئاگاییمانی دانێین. کەواتە دەتوانین بڵێن خود ـ شتێکی هەمیشە بەجوڵە، کە جڵەوی هەستەکان و بیرکردنەوەکانمانی لەدەستگرتووە، دەشێت شتێک بێت کە لە هەموو شتەکانی تر جودابێت. هیگڵ، لە ناو فەیلەسوفە

ئەڵمانیەکاندا، دیارترین فەیلەسوفی مێژووی فەلسەفەیە کە گەورەترین تیشکی خستبێتە سەر ئاگایی؛ ئاگایی وەک ڕۆحێکی موتڵەق دەبینی، کە (بەپێی فەلسەفەی هیگڵ) لە دوائەنجامدا هەموو شتێک دەزانێت و دەشتوانێت پەی بە هەموو شتێک بەرێت. بەڵام ئەمرۆکە یەکجار بەو شێوەیە هێندە زۆر چاوەڕوانی ئاگایی نین کە شت بزانێت، چونکە وەک ئاشکرایە فەلسەفە، گەر بە وویستی خۆی بووبێت یان بەناچاری، لەگەڵ ئاکامی لێکۆڵینەوە مۆدێرینەکاندا دەڕوات کە سەبارەت بە ئاگایین، ئەو ئاکامانەش لەلایەکەوە گەشبینانە دیارن و چاوەڕوانی داهاتوویەکی باشیان لێدەکرێت، وە لەلایەکی تریشەوە ڕەشبین دێنە پێشچاو و مایەی نائومێدین. "جولیان جەینس"ی دەروونناس "و پسپۆری ئاگایی" ئەمریکی تێزێکی زانیاری سەبارەت بەم بابەتە نووسیوە و لەوێدا دەڵێت؛ لەوانەیە ئاگایی (نزیکەی 3000 ساڵ لەمەوبەر) بە شێوەیەکی ڕێکەوت لە ناو دیاردەی فیکردا سەریهەڵدابێت، لێرەشەوە ڕێی تێدەچێت ڕۆژێک لە ڕۆژان (هەر بەهەمان شێوەی ڕێکەوت) دیسانەوە وون ببێتەوە...

(کەواتە دەبێت بەشێوەیەک لە شێوەکان، پەیوەندیەکی پەنهان لە نێوان لەش و ئاگاییدا هەبێت... جیهانی سۆفیا، لا.*252، 280، 290، 303، 347، 381، 464، 478، 491، 514)

### Anthistenes ئانسیستێنیس

ئانسیستێنیس "نزیکەی 445 بۆ 360 ی پێش مەسیح" قوتابی سوکرات بووە و بە بڕوای ئەم مرۆڤ تەنها ئەو کاتە بە شێوەیەکی ڕاستی مۆڕاڵی دەژی کە بتوانێت لە هەموو جۆرە فریوێکی دەرەکی تەواو سەربەست بێت. واتە ئەو بەختیاریەی کە مرۆڤ دەتوانێت پێیبگات، لەڕاستیدا پەیوەندی بە شتە دەرەکیەکانەوە نیە، بەڵکو لە قایلبوونی ناوەوەی مرۆڤەوە هەڵدەقوڵێت و هیچیتر، وە ئەمەش لە ڕێگەی قەناعەتکردنی خۆیەوە بە دەستیدەهێنێت. ئەو کەسانەی بڕوایان بەم جۆرە بیرکردنەوەیە هەیە، پێیان دەگوترێت سینیکەکان ("سینیک" واتە سەگ، ئەمەش لەقەبی دیۆجێنیسی فەیلەسوفە. دیۆجێنیس سروشی لە ئانسیستێنیسەوە وەرگرت و شێوە ژیانێکی سەیر و سەمەرە دەژیا، دواتریش چەندین نوکتەی پێکەنیناویان لەسەر دانا).

(دەکرێت ئەم گوتەیە بکرێتە ناونیشانی فەلسەفەی سینیکەکان، کە ئانسیستێنیس لە نزیکەی ساڵی 400ی پێش مەسیحدا و لە ئەسینادا بنچینەکەی دامەزراد... جیهانی سۆفیا، لا 141)

### Andersen، Hans Christian ئانەرسن، هانس کریستیان

ئەم نووسەرە دانیمارکیە "1805 بۆ 1875" لە ژینگەیەکی ساکاردا وەک کوڕی پینەچیەک هاتە دونیاوە، دەیویست بەختەوەربێت و بەختەوەریش بوو. هەر زوو جێگەی خۆی لە ناو دڵی سەروەتمەندان و گەورەپیاواندا کردەوە، ئەوانیش پشتگیریان کرد و بەو شێوەیەش توانی بەردەوامی بە ساڵانی پڕ لە کەساسی و نەبوونی خوێندنەکەی بدات. ئانەرسن بەهۆی چیرۆک و حەکایەتەکانیەوە بەناوبانگ بوو کە بۆ منداڵانی دەنووسی. نووسینەکانی مۆرکی شێوە زمانێکی زۆر تایبەتی پێوەیە کە شێوازی داڕشتنی نووسینی

ڕۆمانسی و ئایرۆنی پێکەوە گرێدەدات. سیۆرن کیاگەگۆی فەیلەسوف و هاوڵاتیشی بە هەمان شێواز دەینووسی.

(حیکایەتێکە کە لە لایەن نووسەرێکی دیاریکراوەوە نووسراوەتەوە، بۆ نمونە لە لایەن ە.س. ئانەرسنەوە... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 376*، 402، 417)

**Augustin ئاوگوستین**

ئاوگوستین (لە بنەڕەتدا ناوی ئاوریلیۆس ئاوگوستینیۆس بووە، 354 بۆ 430) لە شاری تاگاستا (شاری سوق عراسی ئەمڕۆکەی جەزائیر)ی باکوری ئەفریقادا لەدایکبووە. مۆنیکای دایکی مرۆڤێکی پڕ لە چالاکی و بڕوایەکی پتەوی بە ئاینی مەسیحی هەبووە. دایکی کاریگەریەکی مەزنتری لەسەر ئاوگوستین هەبوو وەک لە باوکە بێبڕواکەی، هەرچەندە لە سەرەتادا کاریگەری دایکی هێندە بەئاشکرا نەدەبینرا. ئاوگوستین لە تەمەنی گەنجیدا نووسراوە لاتینیەکانی دەخوێندەوە، بەتایبەتیش سیسیرۆ، بەڵام گرفتێکی گەورەی لەگەڵ نووسراوە یۆنانیەکاندا هەبوو و بەدرێژایی ژیانیشی وەک شتێکی نامۆ بەلایەوە مایەوە. سیسیرۆ وەک ئامۆژگاریەک دەیگوت دەبێت لەگەڵ فەلسەفەدا مامەڵە بکەین و سەرقاڵیبین، ئەم وتەیەی سروشی بە ئاوگوستین بەخشی و کەوتە گەڕان بەدوای هەقیقەتدا. لەسەرەتادا پێیوابوو پرۆسیسی گەڕان بەدوای هەقیقەتدا هیچ سنوورێکی نیە، ئەوجا تێکەڵی بزووتنەوەی مانیکەییەکان بوو. بێگومان مانیکەییەکان دیدەیەکی دوولایەنیان بەرامبەر جیهان هەبوو و لەو بڕوایەدابوون جیهان لە بنەڕەتدا بەسەر باشە و خراپەدا بەشکرابێت. پاشتر لە شاری کارتەگۆدا بۆتە قوتابی بەشی ڕەوانبێژی، دواتریش دژ بە ویستی دایکی بەرەو ڕۆما کۆچیکرد، لەسەر خوێندنەکەی بەردەوامبوو و پلەیەکی باشی بەدەست هێنا، پاشان لەنێو داروودەستەی پاشایی میلانۆدا پیشەی ڕەوانبێژی پێبەخشرا. پاش ماوەیەک هێدی هێدی لە پلەوپایەی دنیایی دووردەکەوێتەوە و هاوسەرەکەی بەجێدەهێڵێت، کە دوانزە ساڵبوو پێکەوە دەژیان و کوڕێکیشیان پێکەوە هەبوو. لە ساڵی 386 دا وەرچەرخانەکەی بە تەواوەتی ئەنجامدەدات، ئەمەش بە یەکێک لە ڕووداوە گرنگەکانی مێژووی فەلسەفە لە قەڵەمدەدرێت. لەو کاتەشەوە چەندین جار دەربارەی ئەو بابەتەی لە دووتوێی کتێبە هەرە بەناوبانگەکەیدا کە ناوی "دانپیانانەکان"ە نووسی. لە ساڵی 387 و لە جەژنی زیندووبوونەوەی مەسیحدا، بڕیاریدا کە ئەمبرۆسیۆسی قەشەی گەورەی میلانۆ جەژنی ناولێنانی بەمەسیحیبوونی خۆی و کوڕەکەی ئەنجامبدات. دواتر ئاوگوستین دەگەڕێتەوە بۆ ئەفریقا و لەگەڵ هاوبیرەکانیدا لە شاری تاگاستا، ئەو شارەی کە تێیدا لەدایکبوو، کڵێسەیەک دادەمەزرێنێت، دواجاریش دەبێتە قەشەی گەورەی شاری هیپۆ ڕیجیۆس. لەتەمەنی 74 ساڵیدا لەکاتی ئابڵۆقەدانی هیپۆ لەلایەن وەندالیەکانەوە، کۆچی دوایی دەکا.

ئاوگوستین پتر لە 90 کتێبی نووسی، جگە لە چەندەها نامە و وتاری ئاینیش. ئەو کەسانەی لە سەرەتادا ژیان نامەی ئاوگوستینیان نووسیەوە، سەریان لەو هەموو زانیاریەی ئەم مرۆڤە سوڕدەما، بڕوایان نەدەکرد کە تەنها کەسێک توانایەکی هێندە مەزنی هەبێت و ئەو هەموو مەعریفەیە بئاخنێتە ناو کارەکانیەوە. ئەو خاڵەش کە بەلای فەلسەفەوە گرنگە، زیرەکی و چاپوکی ئاوگوستینە لە شیکردنەوەی کات و مێژوودا.

هەرچەندە ئەم لە مێژەوە خۆی لەگەڵ بڕواکردن بە شتێکی مەزنتردا خۆی گونجاندبوو، بەڵام لەگەڵئەوەشدا لە لێکۆڵینەوەکانیدا کات دەگەڕێنێتەوە سەر خاڵێک کە دەتوانین گرنگترین ئاکامی تێدا بەدیبکەین، ئەویش توانای هەستکردنی تاکەکەسە. بەلای ئەمەوە خود لەناو تەوژمی کاتدایە و دەبێت لەو ڕاستیە تێبگات کە ڕابووردوی چیتر "بوونی نیە" و داهاتووشی "هێشتام" نەهاتووە؛ بەڵام بێگومان ڕاستیترین بەشی کات "کاتی ئێستاکە" خۆی لە نێو چەندەها چرکەی کورتخایەندا بزردەکات، بەم شێوەیەش پێشئەوەی خود فریای ئەوە بکەوێت هەستی پێبکات، ڕادەبووڕێت. ئێمە تەنها لەڕێگەی پێکهاتەی تایبەتی ئاگاییمانەوە، کە دەگەڕێتەوە بۆ خودا، دەتوانین خاڵێکی نەگۆڕ لە تەوژمی تێپەڕبوونی کاتدا پێکبهێنین؛ لە ڕاستیدا مرۆڤ توانای یادوەری هەیە کە وێنەی ڕابووردوی لەخۆگرتووە و لە ڕێگەی ئێستاکەوە دەتوانێت مەزەنەی داهاتووبکات. شارەزایی ژیان لە ڕێگەی هاریکاری ئەو ماوە کاتییانەدا سەر هەڵدەدات کە لە ناو ئاگاییدایە، وە شارەزایش بوارێک دەکاتەوە بۆ تێگەیشتنی ئەو سروشتە ئاڵۆز و نادیارەی کە خودای بەخشندە و دڵسۆز لە ڕێگەیەوە خۆی دەردەبڕێت .

لە لایەکی تریشەوە ئاوگوستین بە دۆزەرەوەی بیرۆکەی "گوناحی بۆماوە" دادەنرێت. شێوازی بیرکردنەوەی ئەم، کاریگەریەکی گرنگی لەسەر ڕەوتی بڕواکردنی ڕەسمی کڵێسە بەجێهێشت. هێندە بە سەختی باس لە بەخشینی خودا دەکات، کە بە ئاستەم بوارێک دەهێڵێتەوە بۆ مرۆڤ کە لە ڕێگەی کردەوە باشەکانیەوە خودا ڕازیبکات و هەستبکات شایانی بەخشین و نەمرییە. لە دواجاریشدا هەر ئەم تێڕوانینەی ئاوگوستین، سەبارەت بە بەخشینی خودا، ترسێکی زیاتری خستە دڵی مرۆڤەوە وەک لەوەی دڵیان خۆشکات؛ ئەگەر لە ڕاستیدا، هەروەک ئاوگوستین دەڵێت، هەموو شتێک کرداری خوابێت، کەواتە تەنانەت ئەو کردارە باشانەش کە لەوانەیە مرۆڤ بە شانازی و ویژدانێکی پاکەوە ئەنجامی بدات، لە بنەڕەتدا هێندە مافی مرۆڤی پێوەنەبێت و لێرەشەوە لە بەها و نرخی ئەو کارانە بێبەری دەبێت.

(...دەتوانین لە ئاوگوستینەوە دەست پێبکەین، کە لە ساڵی 354 هەتا 430 ژیا... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 188)

### Idealism ئایدیالیزم

ئایدیالیزم لە مێژووی فەلسەفەدا وێنەی ئەندێشە نمونەییەکان نیشاندەدات. ئایدیالیزم نایەوێت شتەکان بەو جۆرە ببینێت کە هەن، بەڵکو چاوەڕوانی فۆرمێکی باڵاتری هەقیقەت دەکات، هەقیقەتێک کە هەمیشە پەیوەندی بە ئاگاییەوە هەیە. واتە ناتوانین بڵێین ئایدیالیزم ژیان ئاسانتردەکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە. دەکرێت بڵێین جیهانبینینی مەتریالیزم و ئیمپیریزم ئاسانترە، چونکە بەردەوام باس لەو شتانە دەکەن کە گومان هەڵناگرن. هەڵبەتە لایەنێکی زیرەکی لە ناو فەیلەسوفە ئایدیالیستەکاندا بەدیدەکرێت (بۆ نمونە لەلای پلاتۆن و بارکێلی و فیختە و شێللینگ و هیگڵ)، ئەمەش شتێکە کە ئەو فەیلەسوفانە خۆشیان لێیدەدوێن و نایشارنەوە؛ بۆ نمونە لەو بڕوایەدان کە توانای تێگەیشتنیان لە خەڵکانی "ئاسایی" قووڵتربێت. لەلایەکی تریشەوە ئایدیالیزم ڕاست و دروست چەندەها ئەندێشەی مەزن و بیرۆکەی دوورەدەست و بوێری بە مێژووی فەلسەفە بەخشیوە. لەچاو هەموو تیۆرییەکانی تردا، ئایدیالیزم تاڕادەیەکی زۆر

توانیویەتی ئەو ئارەزووانەی ڕۆح پەسەندبکات کە بەسەر شانی مرۆڤەوەیە، مرۆڤیش (زۆر جار) لە چوارچێوەیەکی تەسکی بووندا دەخولێتەوە، بەڵام دەنگی ئەو ئارەزووەی ڕۆح دەپرسێت؛ بڵێیت شتێک نەبێت کە بوونی بمێنێتەوە؟ شتێک کە لە ئێمە زیاتر بژی، یەقینێک کە لە ماوەی ژیانماندا دڵنەواییمان دەداتەوە، بڵێیت ڕووناکییەک لەو سەری تونێلەکەوە بوونی نەبێت؟

(هەروەک کەمێک لەوەوپێش باسمانکرد، هەندێکیان لەو بڕوایەدابوون، کە بوون بە مانا قوڵەکەی سروشتێکی ڕۆحی هەیە. ئەم جۆرە ڕوانگەیەش ناو دەنێین "ئایدیالیزم". جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 246)

### Irony ئایرۆنی

دەتوانین بڵێین سوکرات بابە گەورەی ئایرۆنییە و خاوەنی گەورەترین ئەزموون بووە لەو بوارەدا. سوکرات بەپێی مانا ڕەسەنەکەی ئایرۆنی (لە ووشەی "ئایرۆنیا"ی یۆنانییەوە هاتووە کە مانای خۆنواندن یان خۆلێگۆڕین دەبەخشێت، بەڵام بە شێوەیەک کە لەگەڵ هەقیقەتدا تەبانییە) هەڵسوکەوتی دەکرد و وەک هونەرێکی خۆنواندن بەکاری دەهێنا. لەکاتێکدا کەسانی تر هەبوون کە زیاتر سەرنجیان دەدایە سەر ئەو جیاوازییانەی لە نێوان بوون و بڕوابووندا (دەربارەی شتێک، بۆ نمونە کاتێک دەڵێیت بەبڕوای من...) هەیە، یان کە لە نێوان هەقیقەت و خواستدا هەیە، وە ئەگەر بێت و ئەو جیاوازییانە وەرگێڕینە سەر زمان، ئەوا بێگومان دەتوانین لە ڕێگەی هێنانەوەی چەند نمونەیەکەوە دەریببڕین، بەڵام زۆر بەئاسانتر دەتوانین لە ڕێگەی ئایرۆنییەوە گوزارشیان لێبکەین. بۆ وێنە بە بەکارهێنانی ئایرۆنی دەتوانین شتێکی بچکۆلە، کە تارادەیەک بێبایەخە و هێندە مانای نیە، گەورەبکەین و بەو شێوەیەش مانایەکی پێببەخشین کە لە ڕاستیدا نییەتی. لە سەردەمی ڕۆمانسیدا ئایرۆنی ڕۆڵێکی زۆر تایبەتی دەبینی؛ لەو سەردەمەدا ئایرۆنی ببووە جۆرە فەلسەفەیەکی ژیان و یاری بەسەرجەم بابەتە گرنگەکان و جدییەکان و بێماناکانیش دەکرد (هەروەک فریدریک شلیگڵی نووسەری سەردەمی ڕۆمانسی دەڵێت ئایرۆنی بۆتە شێوەیەکی ئاسانی فێربوون کە دەتوانێت هەموو شتێک ببینێت و لەسەرو هەموو شتێکی پەیوەستەوە خۆی دانێ، تەنانەت لە سەرو خاسیەتە باشەکان و بلیمەتی تاکەکەسیشەوە دەبێت، هەروەها لەسەرو ئەو هونەرەشەوەیە کە مرۆڤ خۆی خوڵقاندویەتی). لەلایەکی تریشەوە هەندێ جار ئایرۆنی پەیوەندی بە گاڵتەجارییشەوە هەیە، سیۆرن کیاگەگۆی فەیلەسوفی دانیمارکیش نمونەی نایابی لەو بارەیەوە هێناوەتەوە، بەڵام لەدوای ئەوەوە تەنها چەند کەسێکی کەم توانیویانە ئەو ڕێڕەوە بگرن، لەبەرئەوە هێشتام لە فەلسەفەدا دەرگای گاڵتەجاڕی بەکراوەیی ماوەتەوە.

(ئەو دەیتوانی "وا خۆی نیشانبدات" کە هیچ نازانێت، یان وایدەرخات کە لە بەرامبەرەکەی بێ ئەقڵترە، ئێمە بەمە دەڵێین "ئایرۆنی سوکراتی". جیهانی سۆفیا، لاپەڕە *76، 409،429)

## ئیتیک Ethic

لە بنەڕەتدا ئیتیک (بۆ وێنە لەلای ئەریستۆتالیس) هاومانای فەلسەفەی کردارییە، ئەمەش کۆمەڵێک لایەنی جیاواز دەگرێتەوە، بۆ نمونە بابەتی تاوتوێکردنی "ژیانێکی باش"؛ ژیانێکی باش چیبە؟ مرۆڤ دەبێت چیبکات بۆ ئەوەی بتوانێت بەپێی پێوانەی ئەقڵ بژی؟ ئەو پێوانەیەی کە وەک ئاشکرایە هەمیشە لە توانای تاکە کەس زیاتر دەگرێتەوە... تێگەیشتنێکی بەم جۆرە لە ئامانجی ئاکاری تاکەکەس تێدەپەڕێت، کە هەوڵدەدات بگاتە ئاسودەیی، لێرەدایە کە کۆمەڵگا و ولات تێکەڵی بابەتەکە دەبن، وە لێرەشەوە ڕۆڵی ئەو بەها ئەخلاقیانەی کۆمەڵگا (بەهەر هۆیەکەوە بێت) دانیان پێدادەنێت، دەردەکەوێت. دواتر ئیتیک، وەک دیسیپلینێکی فەلسەفی، تایبەتمەندێتی زیاتری هاتە پاڵ؛ ئیتیک زیاتر و زیاتر بەرەورووی هەڵسەنگاندنی تاکەکەس خۆی دەڕوات (واتە هەڵسوکەوتەکانی خۆی هەڵدەسەنگێنێت) و هەوڵدەدات پێوانە خۆییەکان لەگەڵ ڕووداوەکانی دەرەوەدا بگونجێنێت "واتە لەگەڵ ڕووداوە بابەتیەکاندا". ئەمرۆکە، ئیتیک ڕووبەڕووی کۆمەڵێک پرسیاری سەخت دەبێتەوە کە دەکەوێتە ناو بازنەی تواناکانی مرۆڤەوە؛ هەرچەندە مەعریفەمان پێشکەوتنێکی یەکجار گەورەی بەدەستهێناوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتام وەک شتێکی بچوک و بێدەرەتان دەردەکەوین ـ ڕێک لەبەرئەوەی ناتوانین ڕاست و دروست سنورێک بۆ هەموو ئەو شتانە دیاریبکەین کە لە تواناماندایە بیانهێنینە دی. مشتومڕە ئیتیکیەکانی داهاتوو لەوانەیە دیسانەوە بگەڕێنەوە سەر نیشاندانی میهرەبانی؛ بۆ نمونە هەر وەک چۆن ئارسەر شۆپینهاوەر "1788 تا 1860" گوزارشی لێدەکرد، ئەم داوای یەکتر خۆشویستنی ڕاستەقینەی دەکرد و لەگەڵ ئەو ئازارەدا گرێبیدەدا کە مرۆڤ لە هەموو لایەکەوە هەستی پێدەکات

(هەر دوو ئیتیکی پلاتۆن و ئەریستۆتالیس، لە زانستی پزیشکی یۆنانی دەچێت... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە *125، 355)

## ئیراسموسی ڕۆتردام Erasmus Rotterdam

ئیراسموسی ڕۆتردام "نزیکەی 1466 تا 1536" بەپێچەوانەی مارتین لۆسەرەوە، کە وەک چاکسازێک دەیویست لە کڵێسەی مەسیحیدا چالاکبێت، لەناو بازنەی بڕواکەی خۆیدا مایەوە. ئیراسموسی مرۆڤدۆست، لەدڵەوە فەیلەسوف بوو و وەک زمانەوانێکیش گوزارشی لە یەزدان دەکرد ، ئەم وەکو لۆسەر هێندە بە تەسکی تەماشای بابەتەکانی نەدەکرد؛ بۆ نمونە دەیگوت بێگومان مرۆڤ پشت بە بەزەیی و دڵاوایی خودا دەبەستێت، بەڵام لەگەڵئەوەشدا جۆرە بوارێکی ئازادیمان هەیە، ئەمەش بەتایبەتی لەو کاتانەدا دەردەکەوێت کە پراکتیزەی شتە باشەکان دەکەین، لەبەرئەوەی بەهای ڕاستەقینەی شتە باشەکان (بەتایبەتیش لەو حاڵەتانەدا کە سەرچاوەی ئەو شتانە لە ناخۆپەریستیەوە هەڵقوڵاوە)، بە بەراوردکردنیان لەگەڵ پەیامەکان و مۆراڵدا، تەنها لە کاتی ئازادیدا دەردەکەوێت. ئەم پەیامە لە بنەڕەتدا ئاڕاستەی تاکەکەس دەکرێتەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا پەیامێکی گشتیە و هەموو کەسێکیش دەگرێتەوە.

(چەندین چاککاری تر هەبوون، کە وایان بەباش دەزانی لەناو کڵێسەی ڕۆمی ـ کاتۆلیکدا بمێننەوە. یەکێک لەوانە ئیراسموسی ڕۆتردام بوو... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 227)

### Eros ئیرۆس

ئیرۆس، کوڕی ئافرۆدیت، لە بنەڕەتدا کوڕی خوای خۆشەویستی یۆنانی کۆنە (ووشەی ئیرۆس لەلای ڕۆمانیەکان بووە بە ووشەی ئامۆر). بەپێی نووسراوەکان هەندێ جار ئیرۆس زۆرزانبووە، بەڵکو تا ڕادەیەکیش نیەتی خراپبووە؛ کوڕێکی گەنج و جوانە، یان بە تیروکەوانێکەوە یان بە مەشخەڵێکەوە دەسوڕێتەوە. هیچ کەسێک لەبەرامبەریدا هەست بە دڵنیایی ناکات، لەوانەیە ئەم حاڵەتەش لایەنێکی جوانی سیحری خۆشەویستی پێکبهێنێت. دواتر لایەنە مرۆڤایەتیەکەیان لە ئیرۆس داماڵی و لێرەشەوە بارە دەمدەمیەکەی لەدەستدا؛ پلاتۆن ئیرۆس دەکاتە هێزێکی پاکی جوانناسی (ئیرۆس واتە گەڕان بەدوای ئەو شتە جوان و باشانەدا، کە مرۆڤ دەگەێنێتە پیرۆزی). بەڵام بێگومان پیرۆزیش (بەپێی ئەم فەیلەسوفە) دەبێت لە شتێکەوە بەرەو شتێکی تر سەرکەوێت؛ دەبێت لە قووڵایی هەستەکانەوە بۆ سەر ترۆپکی چیای ڕۆح بەرزببێتەوە، لەوێدا مرۆڤ بەچاکی دیمەنی جیهانی ئەندێشە (بیر) دەبینێت.

(پلاتۆن بەم تاسەیەی دەگوت ئیرۆس، کە مانای خۆشەویستی دەبەخشێت... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 97)

### Empirism ئیمپریزم

ئیمپیریزم بە پێچەوانەی ڕاشێۆنالیزمەوە، کە زیاتر خۆی بە نوێنەری ئەقڵ دادەنێت، دێت و ڕاست و دروست بنچینەی خۆی لەسەی هێز و توانا هەستییەکان هەڵدەچنێت. وەک دەڵێن تێگەیشتنی هەقیقەت دەبێت لەڕێگەی هەستەکانەوە بانگەشەی بۆ بکرێت. ئیمپیریزم باس لەو زانیاریانە دەکات کە بنچینەی مەعریفە پێکدەهێنن. تاڕادەیەک دەتوانین بڵێن ئیپیکور بنچینەی ئیمپیریزمی دامەزراند، دواتریش لەسەر دەستی فەیلەسوفە بەریتانیەکاندا (جۆن لۆک و دەیفید هیوم و جۆن ستیوارد میبل) بووە بیروبۆچوونێکی جیهانی. بێگومان جۆرج بارکێلی هاوڵاتیشیان بەبێئەوەی گوێبداتە بیروبۆچوونە تایبەتییەکانی خۆی، بەشداری خۆی خستە سەر ئیمپیریزم. زانینی ئیمپیرستی هەوڵدەدات بگاتە ئەوپەڕی دڵنیایی، ئەمەش بوو بە ئیدیالی ئەو زانستانەی میتۆدی ماتماتیکی بەکاردەهێنن. بێگومان هەموو ئەو زانستانەش تەواو بە ئاگان لەوەی کە گیریان خواردووە و ماوەیەکی دوورودرێژە بەوپەڕی توانایانەوە هەوڵدەدەن لەو شێوە ئیمپیریزمیە کلاسیکیە بێنەدەرەوە.

(باشە، چ جۆرە ناوێکی درێژ درێژ بەکاردەهێنیت! دەتوانیت دووبارە مانای "ئیمپیریزم"م بۆ ڕوونبکەیتەوە؟... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 278*، 301، 495)

### Epicur ئێپیکۆر

بەپێی نووسەرە کۆنەکانی مێژووی فەلسەفە، ئێپیکور "341 تا 271 ی پێش مەسیح" لە تەمەنی لاوێتیدا زۆر زیرەکبووە و وەک گەنجێک بووە بە فەیلەسوف. ڕۆژێکیان لە

قوتابخانەدا لە مامۆستاکەی دەپرسێت؛ "مادەی گەردوون لە چ شتێکەوە هاتۆتە بوون؟" مامۆستاکەی بەتەواوەتی دەشڵەژێ و دەڵێت؛ "ناتوانین هیچ شتێک دەربارەی ئەو بابەتە بزانین، بەڵام فەیلەسوفەکان خولیای وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەن!". دەڵێن دواتر ئێپیکور بەو مەبەستەی ببێتە فەیلەسوف دەست لە قوتابخانە هەڵدەگرێت، لێرەدا ئێمە دەتوانین بڵێین بۆ ئەوەش بوو کە قوتابخانەی فەلسەفی تایبەت بە خۆی دابمەزرێنێت. ئەو فەلسەفەیەی کە ئەم هێنایە کایەوە، بۆ ماوەیەک کۆمەڵێک خەڵکی زۆری لە خۆی کۆکردەوە، بێگومان ئەمەش پەیوەندیەکی زۆری بە کەسایەتی ئێپیکورەوە هەبووە وەک مامۆستایەک؛ ئێپیکور وەک مرۆڤێکی میهرەبان و دۆستخواز ناسراوە، بەتایبەتیش بە شێوەیەکی دۆستانە مامەڵەی لەگەڵ خەڵکیدا کردووە. چەندین هاوەڵی فەیلەسوفی، کە ئەم هێندە میهرەبانانە مامەڵەی لەگەڵدا نەدەکردن، لۆمەی ئەو ڕەفتارە دیموکراتیە ناپێویستانەی ئەویان دەکرد. لە فەلسەفەی ئێپیکوردا هەوەس (یان ویست) وەک خاڵێکی گرنگ و بنچینەیی دەردەکەوێت، بەڵام ئەم، بەبەراوردکردنی لەگەڵ ئاریستۆپۆسی فەیلەسوفدا، لە ڕوانگەیەکی زۆر جیاوازترەوە بابەتی هەوەس و ویستی هەڵدەسەنگان؛ بە بڕوای ئاریستۆپۆس ویست تەنها لە کاتی سەرهەڵدانیدا تێردەکرێت، بەڵام ئێپیکور لە ڕێگەی ویستەوە تەرزی ژیانێکی دادەڕشت کە باسی لە جۆرە زاڵبوونێکی زیرەکانەی بەسەر خوددا دەکرد. جۆرە ژیانێک کە دوورە لە توندڕەوی، کە بەدوای ویستەکاندا ڕاناکات، بەڵکو لەبری ئەوانە ژیانێکی گۆشەنشینی هەڵدەبژارد. بەڵام نەک هەموو جۆرە تەنهاییەک، لێرەدا باس لە گۆشەنشینییەک دەکات کە بەباشی هەڵسەنگێنراوە، ئەو دەیگوت؛ "لە نهێنیدا بژی!". بەم شێوەیە ویست بەلای ئێپیکورەوە تاڕادەیەک مانای تێربوون دەبەخشێت، وە تەنها ئەو کاتە بەو تێربوونە دەگەین کە بەتەواوەتی لە بەهای دورەپەرێزبوون لە ئازار و نەویستن تێبگەین، لەمەش زیاتر مرۆڤ ناتوانێت چاوەڕوانی ئاسوودەییەکی زیاتربێت. ئەو کاتە مرۆڤ دڵشادەبێت کە بتوانێت تاڕادەیەک ژیانێکی لەشساغی بەسەربەرێت و خۆی لە هەستە ئازاربەخشە گەورەکان بپارێزێت. کاتێکیش مرۆڤ لەم حاڵەتە تێگەیشت، ئەو کاتە دەتوانێت هەست بە شادمانی بکات و هێمن ببێتەوە ـ لێرەدا ئێپیکور زیرەکانە ووشەی یۆنانی "ئاتاراکسیا" بەکاردەهێنێت کە پڕاوپڕ مانای "هێوربوونەوە و سەقامگیربوونی مێشک" دەگرێتەوە. فەلسەفەی ئێپیکور لەهەمان کاتدا هەم ئیمپیریستیە و هەم کرداریشە. تیۆری مەعریفەکەشی بە هەمان شێوەیە. ئەو پشت بە مۆرکە هەستیەکان دەبەستێت؛ هەستەکان بە شێوەیەکی گشتی پەیامێکی متمانەپێکراومان پێدەبەخشن و دەتوانین لە ڕێگەیانەوە دونیابینینێکی پتەو هەڵبچنین. جگە لە ئەتۆمەکان، مۆرکە هەستیەکان درک بە هەموو شتێک دەکەن؛ چونکە ئەتۆمەکان زۆر پچکۆلەن، وە بە هۆی پچکۆلەیشیانەوە (بە پێچەوانەی ئەتۆمەکانی دیمۆکریتسەوە) بەسەربەستی و بە خێراییەکی یەکجار زۆر دەجوڵێنەوە. دەبێت بەچاوێکی پڕلەڕێز و پێزانینەوە تەماشای ئێپیکور بکەین، چونکە کاتێک تەماشای ئەو بیرۆکانە دەکەین کە لەوەوە بۆمان ماوەتەوە، چەند حیکمەتێکی نەمری تێدا بەدیدەکەین؛ بۆ نمونە ئەو دەیگوت "بێمانایە گەر لە مردن بترسین؛ لەبەرئەوەی کاتێک ئێمە بوونمان هەیە، مردن بوونی نیە وە کاتێکیش مردن بوونی دەبێت، چیتر ئێمە بوونمان نابێت."

(نزیکەی ساڵی 300 ی پێش مەسیح، ئێپیکور قوتابخانەیەکی فەلسەفی لە ئەسینادا دامەزراند... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 143*، 418)

### ئێمپیدۆکلس Empedokles

ئێمپیدۆکلس "نزیکەی 494 تا 434 ی پێش مەسیح" لە چەندین بواردا بەهرەمەندبوو. ئەم پیاوێکی ناسراوی دەوڵەت و پزیشکێکی بەتواناش بووە، وە بە پێی ئەریستۆتالیس، بنچینەی رەوانبێژی دامەزراندووە. وەک کەسێکی ئەروستوکراتی پشتگیری لە دیموکراتی دەکرد. خەڵکی لە شاری ئەگراگاسدا، شاری لەدایکبوونی، لێی پەستبوون و وەک کەسێکی ناحەز لەقەڵەمیان دەدا. ئێمپیدۆکلیس بۆ یەکەین جار ناوی چوار رەگەزەکەی (واتە ئاگر و خاک و هەوا و ئاو) هێنایە ناو فەلسەفەوە و شوێنی تایبەتی پێبەخشین. ئەم چوار توخمە هەتاهەتایین و لە هەموو شتێکدا هەن، وە بە هاریکاریان لەگەڵ پرێنسیپی خۆشەویستی و رقدا، رێرەوی هەموو رووداوەکانی جیهان دەستنیشاندەکەن، بەم شێوەیەش جیهان گۆڕانکاری بەسەردا دێت (لێرەوە روانگەی ئێمپیدۆکلس دژ بە دیدەی پارامێنیدسی هاوەڵی و قوتابخانەی ئیلیاییەکان دەوەستێتەوە). لە رێگەی ئەو نووسینە کەمانەی کە وەسفی ئێمپیدۆکلس دەکەن، چەندین بیرۆکەی سەرسورهێنەر و تا رادەیەکیش مۆدێرنیمان بەرگوێ دەکەوێت؛ بۆ نمونە باس لەوە دەکات کە مرۆڤایەتی بەکۆمەڵ کەوتونەتە ناو گوناحەوە، چونکە لە رێگەی هاتنە ناو "جەستەوە" سزادراون، هەروەها دەڵێت رۆح "هاتنە خوارەوەی خودا" یەو بێوچان لە کۆچکردندایە.

(ئێمپیدۆکلسی خەڵکی سیسیلیان ئەو گرێ سەختەی کردەوە... جیهانی سۆفیا، لاپەرە 46*، 51، 57، 93، 383، 389)

### ئەریستۆتالیس Aristotales

ئەریستۆتالیس "384 بۆ 322 ی پێش مەسیح" لە شاری ستاجیرۆسدا لەدایکبووە، نیکۆماشۆسی باوکی پزیشکبووە و بۆ ماوەیکیش پزیشکی تایبەتی ئامینتاسی پاشای مەکەدۆنیابووە. ئەریستۆتالیس لە تەمەنی 17ساڵیدا بەرەو ئەسینا کۆچدەکات و دەبێتە قوتابیەکی ئەکادیمیەکەی پلاتۆن. پەیوەندی لەگەڵ مامۆستاکەیدا، کە خاوەنی کەسایەتیەکی ئاڵۆزبوو، دەبێت باش بووبێت، چونکە ئەریستۆتالیس بۆ ماوەی بیست ساڵی رەبەق لەوێدا مایەوە. ئەریستۆتالیس ئومێدەواربوو لە پاش مردنی مامۆستاکەی جێگەی ئەو بگرێتەوە و ببێتە سەرۆکی ئەکادیمیەکە، بەڵام ئاواتەکەی نەهاتەدی و لەبری ئەو سپیۆسیپۆسیان هەڵبژارد. پاشئەوە ئەریستۆتالیس ئەسینای بەجێهێشت و رووی کردە ئاسیای بچوک، لەوێشدا لەگەڵ هاوبیرەکانیدا بەردەوامی بە خوێندنە فەلسەفیەکانی دا. هەر لەوێشدا پیسیای خوشکەزای هیرمیاسی ستەمکار دەهێنێت. ئەوجا ئەریستۆتالیس بۆ ماوەیەکی کەم دەبێتە مامۆستای ئەلێکساندەری گەورە (ئەو کاتە لە سەردەمی لاویدا بوو) و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ ئەسینا، لەوێدا ئەکادیمیەکی تایبەت بەخۆی دادەمەزرێنێت "ئەو ئەکادیمیەی کە بە لایکیۆن ناسراوە" و وەک دەڵێن بەردەوام بەو پەڕی میهرەبانیەوە وانەی گوتۆتەوە، هەر لێرەشدایە کە چەندین شاکاری فەلسەفی دەنووسێت. لەگەڵ مردنی ئەلێکساندەردا، بارودۆخی رامیاری ناوچەکەش گۆڕانکاری بەسەرداهات؛ هێزەکانی دژ بە ماکەدۆنی گەشەیانسەند و ئەریستۆتالیسیان بە تاوانی بێخودایی تاوانبارکرد. ئەریستۆتالیسیش رایکرد و بە رەسمی رایگەیاند کە نایەوێت جارێکیتر رێگە بە ئەسینایەکان بدات زەفەر بە فەلسەفە بهێنن "لێرەدا مەبەستی لە

مەرگی پڕ لە کارەساتی سوکراتە"، دواتریش لە ئیبۆیا نیشتەجێبوو و هەر لەوێشدا مایەوە هەتاوەکو دواتر کۆچی دوایی کرد.
لەنێو فەیلەسوفە یۆنانیە سەرەتاییەکاندا ئەریستۆتالیس و پلاتۆن شانبەشانی یەک گەورەترین کاریگەریان لەسەر مێژووی فیکری ئەوروپی بەجێهێشتووە، هەروەها بە یەکەمین کەس دادەنرێن کە جۆرە ڕژێمێکی فەلسەفیان دارشتبێت. هەوڵوتەقەلا و کۆششە گەورەکەی شایانی ئەوەبوو کە بەناوبانگی بکات؛ هەرچەندە لەو 400 نووسینەی کە بەناوی ئەوەوەیە تەنها 80 دانەی ماوەتەوە، بەلاّم لەگەڵئەوەشدا کارەکانی تەواو جێگەی سەرنجن. ئەریستۆتالیس لە چەندین بواری جیاواز جیاوازدا کاری فیکری ئەنجامدەدا، بەلاّم پەرۆشیە فەلسەفیەکەی هەمیشە ئامانجێکی دیاریکراوی هەبوو. لە هەموو کارەکانیدا دەبینین بەدوای زانستێکدا دەگەڕێت کە لە ڕێگەیەوە بتوانێت شتە جۆراوجۆرەکان و شتە تایبەتیەکان پۆل پۆل بکات. بەدرێژایی ژیانی وەک بەرنامەڕێژێک بیری دەکردەوە، هەر ئەم کۆششە بەردەوامەشی لە پشت ئەو ئەنجامە مەعریفیانەوەیە کە بەدەستیهێنا و بۆ هەتاهەتاشە بە ناوی ئەوەوە گرێدەدرێت. بەم شێوەیەش بە یەکەمین کەس دادەنرێت کە بنچینەی لۆژیکی دامەزراند؛ بڕبڕەی ئەم لۆژیکە پشت بە شتە ڕاستەقینەکان نابەستێت و لەبری وان بەدوای ئەو مانایانەی دواتردا دەگەڕێت کە لە ڕێگەی چەند ڕستە و زاراوەی دیاریکراوەوە هەڵدەقولێن. وەک توخمی سەرەکی لەم لۆژیکەدا ڕەچاوی "ڕستەی پێچەوانە" و "پێوانەی لۆژیکی" دەکرێت کە لە ڕێگەی دوو ڕستەی پێکەوەگرێدراوەوە ڕستەیەکی سێهەم وەک دەرئەنجامێکی بێقەیدوشەرت دەردەهێنرێت (نمونەیەکی باو؛ هەموو مرۆڤێک شیاوی هەڵەکردنە/ هەموو فەیلەسوفەکانیش مرۆڤن/ کەواتە ڕێیتێدەچێت هەموو فەیلەسوفێک هەڵەبکات).
ئەندرۆنیکۆس، کە ئەدەبیاتی ئەریستۆتالیسی وەک میراتێک بۆ مایەوە، فەلسەفەی سەرەتایی ئەریستۆتالیس بە "میتافیزیک" لە قەڵەم دەدات (واتە ئەو شتەی لەدوای "فیزیک"ەوە دێت، لێرەدا مەبەست لە فەلسەفەیە) چونکە لە نێو هەموو کارەکانیدا ،زیاتر لەوێدایە کە باس لەپرێنسیبە بنچینەییەکان و هۆکارە بنەڕەتیەکان دەکات. (لێرەدا گرنگە بڵێین کە دواتر میتافیزیک بووە چەمکێکی سەربەخۆ، ئەمڕۆکەش ئەو پرێنسیبە فەلسەفیانە دەگرێتەوە کە سەبارەت بوون و هۆکارەکانیەتی). بەپێی پلاتۆنی مامۆستای ئەریستۆتالیس بوونی هەموو شتە زەمینیەکان تەنها بەرپەرچدانەوەی جیهانێکی بالاّترن کە خۆی ناوی نابوو جیهانی "بیر"، ئەریستۆتالیس بە پێچەوانەی مامۆستاکەیەوە دەڕوانێت و دەڵێت هەموو تاکە شتێک فۆرمێکی لە ناوەوەدا حەشاردراوە کە لێی جودا نابێتەوە. ئەو فۆرمەش بە مادەیەکەوە گرێدراوە کە کاریگەری لەسەردەکات. هەردوو بەشەکەش، واتە فۆرم و مادە، لەگەڵ یەکدیدا دەگونجێن و لە یەکتر جیانابنەوە. شتێکی نزیک بەم بابەتەش بەسەر "هەقیقەت" و "ڕێتێچوون"دا دەچەسپێت؛ تەنها ئەو کاتە دەکەونە پەیوەندیەکی سەبەبیەوە کە چەند هۆیەک لە ئارادابێت (هۆی کاریگەر، هۆی مەبەست، هۆی مادی، هۆی شکڵی). ئەریستۆتالیس تەنها یەک حاڵەتی، بەلاّم حاڵەتێکی گرنگی بە دەراویتەی مەبدەئەکەی دادەنا و لەو ڕێگەیەوە هەوڵیدەدا مەزنەنەی هۆی بنەڕەتی هەموو هۆکان بکات؛ "یەکەمین هۆ"، یان "ئەو هۆیەی کە خۆی ناجوڵێتەوە و لەهەمان کاتیشدا جوڵێنەرە"، دەشکرێت ناوی بنێین "خوا"؛ ئەمەش تەنها فۆرمە کە هیچ مادەیەکی نییە و لە هەموو بەرپرسیاریەک سەربەستە، بە هێمنی و خۆشکەیفیەوە شتەکان بەو جۆرە دەبینێت کە هەن، وە بۆ ئەو ئاشکرایە کە شتەکان بەو جۆرە هەن کە

دەبێت هەبن. هەرچەندە ئێستاکە هێزی سەرەتایی خواییانە لە ژیانی ڕۆژانەدا دوورکەوتۆتەوە، بەڵام لەگەڵئەوەشدا بەردەوام گەردوون و ژیانی جیهان پەیوەستی ئەو هێزە سەرەتاییەن، چونکە لە دواجاردا هەموو یاساکان تەنها لاساییکردنەوەیەکی یەکەمین چالاکی خوڵقاندنن. لە هەمان کاتیشدا ڕێگە بە مرۆڤ بەخشراوە کە لە جوڵێنەری "لە خوای" خۆیەوە نزیکببێتەوە. بەڵێ، بە شێوەیەک لە شێوەکان بە تێگەیشتن لە کارەکانی ئەو، دەتوانێت لاسایی ئەو بکاتەوە؛ لەڕاستیدا مرۆڤ دەتوانێت خۆی بداتە دەست ئەو تێڕوانینە ئارامەی بوون، ئەمەش بەلای ئەریستۆتالیسەوە پیرۆزترین چالاکیە وە لەبەرئەوەش بەرزترین کردارە کە مرۆڤ بتوانێت بە ئەنجامی بگەیەنێت .

ئەریستۆتالیس فەیلەسوفێکە کە ڕقی لە توندڕەویە، ئەمەش هەردوو بابەتی ڕامیاری و ئیتیکیش دەگرێتەوە. ئەم چەند شێوەیەکی بەڕێوەبردنی وڵاتی هەڵدەسەنگاند (هەمووشیان مۆرکی شارە یۆنانیەکانی پێوە دیاربوو) و لە نێوانیاندا شێوەی دیموکراتیەکی سنوورداری بە سەرکەوتووترین شێوەی وڵات دانا. ئەو سنوورداریەش بە تایبەتی کۆیلەکانی ئەو کاتەی دەگرتەوە، چونکە ئەریستۆتالیس بە پێویستی نەدەزانی بیریان لێبکرێتەوە، لەبەرئەوەی بوونیانی بە شێوەیەکی بەڵگەنەویست دادەنا. کۆیلەکان تا ڕادەیەک بەهۆی شەڕی ناهەقانەی داگیرکردنەوە نەبوونەتە کۆیلە، بەڵکو خۆیان کۆیلەن، لەبەرئەوەی نەیانتوانیوە ببن بە شتێکی تر؛ بەلایەنی کەمەوە ئەریستۆتالیس لەم بۆچوونە زۆر نزیکبووە، بەڵام لەگەڵئەوەشدا دڵاوایی خۆی نیشاندەدات و وەک قسەکەرێکی کۆیلەکان دەڵێت؛ دەبێت ڕێگە بە هەموو کۆیلەیەک بدرێت کە هیوای ئەوەی هەبێت ڕۆژێک لە ڕۆژان سەربەستبێت.

ئەریستۆتالیس مرۆڤی وەک بوونەوەرێکی ئەقڵانی دەبینی، لەبەرئەوە ئامۆژگاری هەڵسوکەوتکرنی ئەقڵانی دەکرد. بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستەش پێویستمان بە چەند باشییەک هەیە، بەڵام چەند باشیەک کە نەک تەنها وەک بەهایەک خۆیان لە خۆیاندا ڕاستبن، بەڵکو لەگەڵئەوەشدا دەبێت ئامانجێکی کۆمەڵایەتیشیان هەبێت. هەڵسوکەوتی مرۆڤ بە مەبەستی ئاسودەبوونیانە و گەیشتن بە بەختیارییە، ئەمەش بەلای ئەریستۆتالیسەوە، بە پێی تەرزی بیرکردنەوەی خۆی، لەلایەکی ترەوە بەتوندی بەستراوەتەوە بە سنوورمەندییەوە. لەبەرئەمەش ئاسودەیی پەیوەندی بە هیچ جۆرە هەست وخرۆشێکی تایبەتییەوە نیە، بەڵکو پەیوەندی بە حیکمەتی تەبابوونەوە هەیە لەگەڵ ئەقڵدا، وە لە دوا جاریشدا ئەقڵ هیچ چارەیەکی نامێنێتەوە جگە لەوەی "ژیانێکی باش" بژی.

(ئەریتۆتالیس... پیاوێکی ووردبین کە دەیویست بۆچوونەکانمان ڕێکبخات...جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 42، 71، 102، 108، 114*، 138، 140، 177، 186، 193، 195، 216، 222، 239، 250، 253، 256، 276، 316، 352، 374، 388، 437، 451، 495)

**ئەفسانە**

لەوانیە گرنگبێت کە بڵێین ئەفسانە (myth وشەیەکی یۆنانییە و مانای "ووشە یان چیرۆکێک دەبەخشێت کە بەشێوەی هۆنراوە داڕێژرابێت") مەرج نییە نووسراوێک بێت کە باسی خواکان بکات؛ ڕێیتێدەچێت ئەفسانە باسی ڕووداوە هەرە دێرینە وونەکانیش بکات،

وە بەشێوەیەکی پڕ لە فەنتاسیا یان سیمبول دایدەڕێژێتەوە و بەو شێوەیەش سەر لەنوێ سەرنجی خەڵکی بەلاوە ڕادەکێشێتەوە. ئەفسانە باسی شتێکی بنەڕەتی دەکات، باسی ڕووداوێک دەکات (ئیتر بە هەرە شێوەیەک بێت) کە دەبێتە بنەمای شتێکی تر کە لەدواتردا ڕوویداوە. لەم بارەشدا ئەفسانە ئاماژە بۆ چەند ڕێگا و شوێنێک دەکات کە دێتە ناو کاتی ئێستاکەوە. ئەگەر بمانەوێت لە مانای (ڕاستەقینەی) ئەفسانەیەک بگەین (بێگومان بە شێوەیەکی گشتی ئەفسانە پڕە لە ووشەی ئاڵۆز و پڕە لە نهێنی)، ئەوا دەبێت زۆر بە ووریاییەوە لێی نزیک ببینەوە، زۆر بەووردی گوێی بۆ شلکەین، وە دەبێت لە کاتی پرسیار ئاڕاستەکردندا هیچ حوکمێکی پێشترمان لە خەیاڵدا نەبێت.

(ئەفسانە چیرۆکێکە کە دەبارەی خواکانە و هەوڵی لێکدانەوەی ژیان و سروشت دەدات... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 32)

### ئەقڵ

مرۆڤ هەمیشە پێیوابووە مرۆڤەکانی تر چەندین ڕەفتار و هەڵسوکەوتی جیاوازجیاواز دەنوێنن؛ لەوانەیە لەپێش هەموو شتێکدا مەزنەی خراپەکاری بکات، بەڵام چاوەڕوانی نیشاندانی خۆشەویستی و ڕق و میهرەبانی و ئەقڵانیەتیشە. دەتوانین بڵێین مرۆڤ زیاتر توانای ئەقڵانیەت لەناو خۆیدا دەبینێت و زۆرجاریش ئەقڵییەتی خەڵکانی تر بە سنووردار و دیاریکراو لەقەڵەم دەدات. ئەقڵ واتە چالاکیەکانی هزر، بەڵام بەدەر لەمەش ئەو توانایەی مرۆڤیش دەگرێتەوە کە لە ڕێگەیەوە پەیوەندییە گەورەکان هەڵدەسەنگێنێت و لێیان تێدەگات، لێرەشەوە لەدواجاردا تا ڕادەیەک بڕوا بە شتە ڕاستەقینەکان دەهێنێت. ئەقڵ بەپێی پێناسەیەکی کانت، کە لەوانەیە لە نێو پێناسەی هەموو فەیلەسوفەکانی تردا ئەقڵانیترین پێناسە بێت، "گشتیترین و باڵاترین توانای مەعریفەیە". کانت ئەقڵی خۆشدەویست، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئاماژەی بۆ سنورداریێتی ئەقڵ دەکرد؛ ئەقڵ کاتێک دێتە سەر هەموو ئەو شتانەی کە دەکەونە دەرەوەی بازنەی ئەزموونی مرۆڤەوە تەنها دەتوانێت مەزنەیان بکات، ئەمەش بۆ نمونە بابەتی وەک خودا و ڕۆح و سەرەتا و کۆتایی جیهان و مردن و ژیان لەدوای مردنەوە دەگرێتەوە. ئەو پرسیارانەش کە لە ڕێگەی جۆرە ئەندێشەیەکی ئاوهاوە سەرهەڵدەدەن، دەبنە هۆی وروژاندنی بیرکرنەوەی قوڵ، واتە بەجۆرێکی تر بیڵێین، ئەو پرسیارانە بەردەوام لەبەر هزردا دەبنە بابەتێکی بەربەرەکانێ؛ "لەیەک کاتدا و لە بواری مەعریفیدا ئەقڵ دووچاری چارەنووسێکی تایبەتی و سەیر دەبێتەوە؛ لەلایەکەوە بەدەست ئەو پرسیارانەوە دەناڵێنێت کە ناتوانێت ڕەتیانبکاتەوە، چونکە خاسیەتی پرسیارکردن لە ناو خودی سروشتی ئەقڵدایە. بەڵام لەلایەکی تریشەوە ئەقڵ ناتوانێت وەڵامیان بداتەوە، چونکە پرسیارەکان لە دەرەوەی توانای ئەقڵی مرۆڤدان. هەندێ لە فەیلەسوفەکانی تریش ڕاستەوخۆ ئەقڵ گرێ دەدەنەوە بە ڕۆحەوە و ناوی پرێنسیپی جیهانی لێدەنێن (هیگڵ)، وە هەندێکی تریش (وەک فیختە) لەوبڕوایەدان ئەقڵ لە کاتی ژیانی سەر زەویماندا، وەک دواهەمین ئەنجام، هەوڵی بەدەستهێنانی "دەسەڵاتێکی پەتی" بدات.
لێرەشەوە دەگەڕێینەوە سەر ئەو ڕەوتەی لەسەرەتاوە دەستپێکردبوو؛ لەلای فەیلەسوفە یۆنانیە سەرەتاییەکان (ئەناکساگۆرس) ئەقڵ جۆرە هێز و توانایەکی سەروخودی

پێبەخشراوە؛ دواتریش (بۆ نموونە لای ستۆیکەکان) ئەقڵ بووە ئەقڵێکی جیهانی کە هاوتای شتە خواییەکانە.
ئەمڕۆکە لەبەر چەند هۆیەکی ئاشکرا هێندە چاوەڕوانی ئەقڵ نین. ژیانمان لەسەر تەرزێکی هەمەجۆری دەڕوات بەڕێوە، ئەمڕۆکە دەخوازین لە دڵتەنگی بەدووربین و لەلایەکی تریشەوە گەرەکمانە ڕێگە لە ئارامی بگرین؛ جۆرە تەرزێکی ژیانی ئابەمجۆرەش نە ئەقڵانیەتی تێدایە و نە دەشتوانێت ئەقڵانی بێت. لەبەرئەوە لەوانەیە "میفیستۆ" لە "فاوست"ی گۆتەدا ڕاستبکات کاتێک دێت و بەهای بەکارهێنانی ئەقڵ گرێدەدات بەو کەسەوەی کە داوای دەکات و دەڵێت؛ "ئەقڵ دەبێتە شتێکی بێمانا، دەبێتە میهرەبانی، دەبێتە مایەی بێزاری و ئازار؛ مەخابن، تۆش منداڵێکی ئەویت."

(بەهەمان شێوەش هەموو کەسێک بەبەکارهێنانی ئەقڵیان، دەتوانن هەقیقەتە فەلسەفیەکان ببینن... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 75*، 252)

### ئەلبێرتۆس ماگنۆس Albertus Magnus

ئەلبێرتۆس ماگنۆس (لە بنەڕەتدا ناوی ئەلبێرتی بۆلستۆد بووە) لە نێوان ساڵەکانی 1193 بۆ 1280دا ژیاوە، قەشەیەکی دۆمینیکان و مامۆستای تیۆلۆژی و فەیلەسوفیش بووە. ئەلبێرتۆس لەسەرجەم شارەکانی پادۆا و پاریس و کیۆلین و ۆرزبێرگدا وانەی دەگوتەوە؛ بۆ ماوەی دووساڵیش "1260-1261" قەشەی گەورەی شاری ڕاینیسبێرگ بووە. خەڵکی لە لایەکەوە بە سەرسامییەوە تەماشای حیکمەتی ئەم پیاوەیان دەکرد و لەلایەکی تریشەوە ڕاستەوخۆ دوورەپەرێزبوون لێی، چونکە لە زانیاری پرشنگداری دەترسان و ناچاربوون چاویانی لێبنوقێنن. ئەلبێرتۆس ماگنۆس دەیگوت فەلسەفەی ئەریستۆتالیس و بڕوای ئاینی مەسیحی هاوتای یەکترین و لەگەڵ یەکدیدا دەگونجێن. وەک ئاشکرایە ئەریستۆتالیس بەهۆی بارودۆخی تایبەتی ژیانی خۆیەوە هەمیشە ناچاربوو دان بە هەقیقەتێکی بەرزتردا بنێت .

(تۆماس ئەکویناس مامۆستایەکی بەناوبانگی فەلسەفەی هەبوو، پێیان دەگوت ئەلبێرتۆی گەورە "ئەلبێرتۆس ماگنۆس"... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 200)

### ئەلێکساندەری گەورە

پاشای ماکەدۆنیابووە (لە نێوان ساڵانی 356 بۆ 323 ی پێش مەسیحدا ژیاوە)، وەک فەیلەسوفێک بەناوبانگ نەبوو، بەڵکو زیاتر وەک سەر لەشکرێک ناوبانگی دەرکرد. بۆ نموونە وەک سەرلەشکرێکی بەتوانا (جگە لە شوێنەکانی تر) شانشینی فارسی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی و بەو شێوەیەش بەزۆرەملێ شێوازی ژیان و شێوەی بیرکردنەوەی یۆنانی لە بازنەیەکی گەورەتردا بڵاوکردەوە. ئەلێکساندەر بۆ یەکەمین جار لەڕێگەی ئەریستۆتالیسەوە ئاشنایی لەگەڵ فەلسەفەدا پەیداکرد. ئەریستۆتالیس لە ساڵی 343 وە هەوڵیدەدا وەک مامۆستایەک لە نێو دارودەستەی شایانەی ماکەدۆنیدا ڕۆڵی هەبێت. پاشتریش دەڵێن ئەلێکساندەر لەگەڵ دیۆجێنیسی فەیلەسوفدا گفتوگۆیەک دەکات کە شایانی یادگارە، لەوێدایە کە دیۆجێنیس زۆر بەڕوونی و ئاشکرایی پێی دەڵێت؛

هەرچەندە مرۆڤ کەسێکی زۆر گەورە و خاوەن دەسەڵاتێکی مەزنی ئەم جیهانەش بێت، بەڵام لەگەڵئەوەشدا ڕێیتێدەچێت بیروبۆچوونی هەڵەی هەبێت.

(ڕۆژێکیان دیۆجێنیس لەبەرخۆردا لە تەنیشت بەرمیلەکەیەوە دانیشتبوو، لەو کاتەدا ئەلێکساندەری گەورە هاتە میوانی... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 141)

### ئەناکساگۆرس Anaxagoras

ئەناکساگۆرس "500 بۆ 428 ی پێش مەسیح" لە کۆڵۆنی یۆنانی کلازۆمانیای ئاسیای بچوکدا لەدایک بووە. پاشتر هاتە ئەسینا و لەوێدا بۆ ماوەی چەندین ساڵ وەک تاکە فەیلەسوفێک ڕۆڵی هەبووە. لە تەمەنێکی زۆر پیریدا بە تاوانی بێخودایی تاوانباریانکرد، بەڵام نەگەیشتە سەر ئاستی دادگاکردنی. دواتریش گواستیەوە بۆ لامساکۆس و لەوێدا کەمێک بەر لە مردنی یەکێک لە قوتابخانە سەرەتاییەکانی فەلسەفی دامەزراند. لە هەموو نووسینەکانی تەنها چەند بەشێکی کەمی شاکارەکەی ماوەتەوە کە ناوی "دەربارەی سروشت"ە. لە ڕێگەی ئەو بەشە کەمانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم فەیلەسوفە لەو بڕوایەدایە مادەی هەرە بنەڕەتی لە چەندین "تۆو"ی جیاواز جیاواز پێکهاتبێت کە هەریەک بەجیا شیاوی دابەشبوونە بەسەر بەشی بچوکتردا، لێرەشەوە زاڵترین بەشیان کاریگەریەکی تایبەتی لەسەر شتەکان دەکات و ئەمەش دەبێتە هۆی جیابوونەوەیان. ئەناکساگۆرس یەکێکبوو لەو بیرمەندە سەرەتاییانەی کە وێرای مەزنەی هێزێکی نامادی بکات، ئەو هێزەشی هەم وەک جوڵێنەرێکی بنەڕەتی و هەم وەک سەرچاوەیەکیش دەکردە بەرپرسیاری هەموو شێوە چالاکیەکی ژیانی ئاسمانی و سەر زەویش؛ ئەو ناوی ئەو هێزەی نابوو "نۆوس"، واتە "ڕۆح".

(فەیلەسوفێکی تر کە نەیدەتوانی لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەدا تەبابێت، کە دەیگوت هەموو ژیانی سروشت لە یەک مادەی دیاریکراوەوە (بۆ نمونە لە ئاوەوە) دروست بووە، ئەناکساگۆرس بوو... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 48* و57)

### ئەناکسیماندەر Anaximander

ئەناکسیماندەر "نزیکەی 610 بۆ 545 ی پێش مەسیح" وەک تالیس و ئەناکسیمینیسی هاوەڵی خەڵکی شاری میلیتی سەر قەراخ دەریای ئاسیای بچوک بووە. ئەم فەیلەسوفە لە چەندین لایەندا چالاکبووە، بۆ وێنە دەڵێن یەکەمین نەخشەی جیهانی کێشاوە. ئەناکسیماندەر جۆرە تێڕوانینێکی تەواو مۆدێرنی هێنایە کایەوە؛ وەک خاڵێکی بنەڕەتی باس لە شتێکی "بێسنوور" دەکات و دەڵێت ئەو شتە بە شێوەیەکی هەتاهەتایی و نەمر بوونی هەیە و لێرەشەوە لە بنەڕەتدا دەکرێت ناوی بنێین "شتێکی خوایانە". هەروەها دەڵێت ئەم جیهانەی ئێمە، کە تەنها یەکێکە لە چەندەها جیهانی تر، لە ناو ئەو مادە پڕ لەکاریگەر و نادیارەدایە. ئەناکساگۆرسیش گەشەی بەم بیرۆکەیەدا و دواتریش ئەم بابەتە لە فەلسەفە جیابووەوە و کەوتە نێو زانستە بایۆلۆجیەکانەوە؛ یەکەمین بوونەوەری زیندوو بەهۆی پرشنگی خۆرەوە هاتۆتە بوون کە دەیدا لە لیتاوەکە، واتە لەو

شوێنەدا کە وشکایی و ئاو بەیەک دەگەن، لەوانەیە مرۆڤیش لە هەمان شوێنەوە یەکەمین هەنگاوی نابێت.

(دووهەمین فەیلەسوف ناوی ئەناکسیماندەرمان بەرگوێ دەکەوێت، ئەمیش هەر لە میلیتدا دەژیا... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 43)

### Anaximenes ئەناکسیمێنس

ئەناکسیمێنس "نزیکەی 570 بۆ 526 ی پێش مەسیح" هیچ نووسراوێکی لەپاش خۆی جێنەهێشت، بەڵام لە ڕێگەی نووسراوە مێژوویەکانی پاش ئەوەوە بە ئاسانی بۆمان ڕووندەبێتەوە کە ئەم فەیلەسوفە بایەخێکی گەورەی بە هەوا داوە. بەبڕوای ئەم، هەوا وەک هەناسەیەکی نەمری هەتاهەتایی بە گەردووندا دەڕوات و بەتێکەڵبوونی لەگەڵ ڕەگەزەکانی تردا (واتە ئاگر و خاک و ئاو) پێکهاتەی ڕاستەقینەی شتە جیاوازەکان دروست دەکات. هەروەها بە بڕوای ئەم زەوی شتێکە لە شێوەی مێزێک دەچێت کە لەسەر هەوا وەستاوە و هەر هەواش لە بۆشایدا ڕایگرتووە.

(سێهەم فەیلەسوفی میلیت، ئەناکسیمینس بوو... جیهانی سۆفیا لاپەڕە، 43)

### Berkeley George بارکێلی، جۆرج

هەر لە تەمەنی 15 ساڵیەوە جۆرج بارکێلی "1685 تا 1753" پێینایە کۆلیژی "ترینتی" بەناوبانگی شاری "دۆبلن"ەوە. هاوڕێ خوێنکارەکانی وەک کوڕێکی بەتوانا و زیرەک دەیانناسی و بەئاشکرا ئامادەیی فێربوونیان تێدا دەبینی. لەو کۆلیژەدا جگە لە زمانی کلاسیکی، فەلسەفە و ماتماتیک و تیۆلۆجییشی خوێند. لە ساڵی 1707 دا ناوی قەشەی پێبەخشرا. لە ساڵی "1709" دا یەکەمین کتێبی فەلسەفی بڵاوکردەوە (دەیگوت تیۆریەکی نوێ دەربارەی مەعریفە دەهێنێتە کایەوە) بەڵام نەبووە جێگەی ڕەزامەندی خوێنەران؛ بەتایبەتی ڕەخنەیان لە شێوەی داڕشتنە قورسەکەی دەگرت و دەیانگوت نووسەر زاراوە و ووشەی ئاڵۆز و نادیار بەکاردەهێنێت. دواتر بارکێلی پەیمانی چارەسەرکردن و باشکردنی کتێبەکەیدا؛ بەسەر هەموو کارەکەیدا چووەوە و هەر ساڵێک دواتر کتێبێکی یەکجار گەورەتر و باشتری بەچاپگەیاند. ئەمجارەیان زیاتر سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بەڵام یەکسەر نەبووە نووسینێک کە بە باشی بفرۆشرێت. دیسانەوە جارێکی تریش بەسەر کتێبەکەی "تێزێک سەبارەت بە بنەمای زانستی مرۆیی"دا چووەوە و ئەمجارەیان بە شێوەی دیالۆک دایڕشت، ئەوجا ڕێک بەو شێوەیەی کە خۆی دەیویست سەرنجی خوێنەرانی بەلای خۆیدا ڕاکێشا. لێرەبەدواوە هەستیکرد کاتی سەفەرکردنی دوورودرێژی هاتووە و بەتێروتەسەلی سەفەری بەملاولادا دەکرد، دواتریش وەک بەڕێوەبەری کۆلیژی "دێری" دامەزرا، بەڵام بەهۆی ژنهێنانیەوە ناچاربوو ژیانێکی نیشتەجێتر بژی. دواهەمین سەفەری گەورەشی لە ساڵی 1729 دا بەجێهێنا، ئەو کاتەبوو کە بەرەو دورگەکانی بەرمۆدا کەوتەڕێ و لەوێدا دەیویست خەونە دێرینەکەی بهێنێتەدی؛ لەو دورگانەدا چەند کۆڵۆنیەکی ئینگلیزی لێبوو، بارکێلیش دەیویست قوتابخانەیەک بۆ کوڕە ئینگلیزەکانی

ئەوێ و کوڕە گەنجەکانی لەدایکبووی ئەوێ دابمەزرێنێت، کە تێیدا ئاین بخوێنن و پاشانیش ببنە بڵاوکەرەوەی ئاینی، بەڵام پلانەکەی سەرینەگرت و بە دڵشکاوی گەڕایەوە بۆ ئێرلەندا. لەپاش ئەم نائومێدییەی، لە ساڵی 1734 دا داوایان لێکرد ببێتە قەشەی گەورەی شاری "کلۆین"، بەخشینی ئەو پلە گەورەیەش دڵنەواییەکی مەزنی بە بارکێلی بەخشی و هەستیدەکرد هێشتام لە سەردەمەکەیدا ماف بوونی هەیە، هەتاوەکو کۆچی دوایشیکرد هەر وەکو قەشەیەکی ئەو شارە مایەوە.
بارکێلی یەکێکبوو لەو فەیلەسوفە یەکەمینانەی کە دەیگوت ئاگایی مرۆڤ توانایەکی گەورەتری هەیە وەک لەوەی تەنها کاری ئەوەبێت پەی بە مۆرکە هەستیەکان بەرێت و کاریان لەسەربکات. ئەم، ئاگایی بە هەرە گرنگترین شت لە قەڵەم دەدا و وەک شانۆیەک دەیبینی کە ڕووداوەکانی ژیانی لەسەردا نمایشبکرێت. بەپێی ئەم هەموو شتێکیش کە لەدەرەوەی ئەو شانۆیەدا ڕوودەدەن، شایانی سەرنجلێدان نین، پراوپڕ لەبەرئەوەی لەناو ئاگایدا بوونیان نیە. بارکێلی ناڵێت جیهان خۆی بۆ خۆی خاوەنی بوونێکی مەتریالیش نیە، بەڵکو لەو بڕوایەدایە کە ئەو بوونە مەتریالییە پەیوەستی ئاگایی بێت. هەموو خاسیەتێکی شتەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئاگایی و زۆر پێویستیشن بۆ ئەو پرۆسیسە دوروودرێژەی ژیان کە پێی دەگوترێت شارەزایی پەیداکردن. ئەم جۆرە ئایدیالیزمە ڕیشەییەش، کە لە هەمان کاتدا دان بە هەبوونی لایەنێکی مەتریالی دەدات، سروشێکی بەربڵاوی خستە بەردەم گفتوگۆکردنە فەلسەفیەکانی سەردەمێک کە سەرەتای سەرهەڵدانی تیۆری زانستی بەخۆیەوە دەبینی. جگە لەمەش بارکێلی فەلسەفەکەی بە شێوەیەک دارشتبوو، کە لایەنی تیۆلۆجیشی لەناواخندا لەخۆ گرتبوو، ئەو بێ پێچ وپەنا دەیگوت؛ ئاگایی سەرچاوەکەی خوایانەیە وە بەهۆی خواوەندەوە لەناو مرۆڤدا کاردەکات. ئاگایی بۆیە کاردەکات، چونکە هیچ چارەیەکی تری نیە وە لە دواهەمین ئەنجامدا دەکرێت وەک دیارییەک تەماشابکرێت کە لە کاتێکی دیاریکراودا یەزدان بە هەموو مرۆڤێکی سەر ئەم زەویە تاقانەیەی بەخشیوە.

(بارکێلی... "وەک تۆپێک بە ئاسمانەوە بەدەوری خۆرێکی ئاگریندا دەخولێتەوە..." جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 105، 158، 179، 250، 275، 278، 284، 300*، 315، 323، 326، 340، 345، 377، 382)

### Bruno Giordano برونۆ، جیۆردانۆ
نووسراوی سەر پەیامەکانی ئەو کاتە بەم جۆرە وەسفی برونۆیان دەکرد؛ ئەم پیاوە (تاوانبارێکی دۆمەنیکانە) و (سەرسەختێکی لە ئاین لادەرە)، دواتریش لە ڕۆژی 17 ی 2 ی 1600 دا لە شاری ڕۆمادا بە ئاگر سوتاندیان؛ جیۆردانۆ برونۆ "لە ساڵی 1548"دا لە دایکبووە. ئەم مرۆڤە قەشەیەکی چاونەترس بوو و بەدرێژایی ژیانی لەسەر قسەی خۆی سووربوو. بەرهەڵستکارەکانی پڕاوپڕ وەک مرۆڤێکی بۆڵەبۆڵکەر دەیانبینی، بەڵام لایەنگرەکانی وەک کەسێکی پیرۆزی پڕ لە حیکمەت لە قەڵەمیاندەدا. برونۆ بەرگری لە باوەڕەکەی دەکرد و دەیگوت ئەقڵیەتێکی گشتی کە هەموو شتێک دەگرێتەوە، بەرزترین یاسای بنچینەیی گەردوونە. هەروەها ئەم ئەقڵیەتە ڕۆحی گشتی جیهانیش دەگرێتەوە کە تەنانەت کار لە بچوکترین بەشی شتە زیندووەکانیش دەکات. لەڕێگەی جیهانبینینێکی ئاوهاوە، هیچ ڕۆڵێکی گونجاو و لەبار بۆ خودا نامێنێتەوە، بەپێی برونۆ

خودا بوونەوەرێکی سەرومادییە و هزری مرۆڤ ناتوانێت لێیتێبگات؛ لێرەشەوە ناتەبایی لەگەڵ دەسەڵاتی کلێسەدا سەریهەڵدا. دواهەمین ڕستەشی، کە بۆ هەتاهەتایە دەنگدەداتەوە، ناوبانگی خۆی لە مێژوودا هەیە؛ بڕیاری دادگاکەی بەم شێوەیە وەرگرت و گوتی "من لە ئێوە کەمتر دەترسم، هەرچەندە ئێوە حوکم دەردەکەن و من وەریدەگرم."

(چارەنووسی جیۆردانۆ برونۆش باشترین نمونەی دڵتەزێنی ئەو بابەتە دەخاتەڕوو... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 215*، 234، 372)

**بڕوا**

بڕواکردن هەقیقەتێکی هێندە تایبەت بە خۆی هەیە، کە پەیوەستی لایەنی بەڵگە هێنانەوە نییە؛ تا ڕادەیەکی دیاریکراو ئەو پەندە کۆنە پڕ لە حیکمەتەی دەڵێت "ئەو کەسەی کە بڕوای هەیە، تەنها نامێنێنەوە" ئێستاکەش وەک شتێکی سەیر دەبینرێت. ناواخنی ئەم وتەیە بڕوا و قەناعەتی ئاینی پێکەوە گرێدەداتەوە _یەقینێکی تایبەتیە کە سەرچاوەکەی لە بڕوایەکی قووڵی ناوەوە دێت، یان بڕیاردانێکی خوایانەیە کە لە شتێکی باڵاترەوە بەدەستهێنراوە، هەر لەبەر ئەم هۆیەش بڕواکردن پەیوەندییەکی پتەوی بە (سروتی) ئاینییەوە هەیە. جگە لەمەش تاڕادەیەک دەکرێت بڕواکردن بە هەموو جۆرە دیاردەیەکەوە گرێبدرێتەوە، وە دەکرێت بڕوا ببێتە هۆی پەیداکردنی جۆرە "توانایەکی هزری"، کە کەسایەتیە بەناوبانگەکانی جیهانی وەرزش ،بۆ نمونە "بەیکەر"، زۆرجاران ناوی دەهێنێت. لە لایەکی تریشەوە مایەی سەرسوڕمان نیە کە بڕواکردن (چیتر) هیچ جۆرە ڕۆڵێک لە بواری فەلسەفەدا نابینێت، چونکە دەکرێت بڵێین فەلسەفە خۆی لە خۆیدا هەوڵدانێکە بۆ ڕزگاربوون لە بڕوا و نزیکبوونەوەیەکە لە زانین. بەڵام ئێستاکە وادەردەکەوێت کە زانین شتێکی لاوازبێت؛ چونکە هەتاوەکو زیاتر پێمان وابێت شت دەزانین، کەمتر و کەمتر لایەنە پڕ نهێنییە ڕاستەقینەکانمان بۆ دەردەکەوێت.

(تەنها "بڕوا_ئیمان" دەتوانێت لەو بابەتە گرنگانەمان نزیک بکاتەوە... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 406)

**Buddha بودا**

بنچینەدانەری ئاینی بودیزمە "نزیکەی ساڵی 560 تا نزیکەی 480ی پێش مەسیح"، وەک کوڕە میرێک لەو ناوچەیەی کە ئەمڕۆکە پێی دەڵێن "نیپاڵ" لەدایکبووە. دەگێڕنەوە دەڵێن لە تەمەنی 29 ساڵیدا واز لە هەموو سامانەکانی دێنێت، هەروەها ژنێکی گەنجی جوان و منداڵێکی کوڕی چکۆلەی شیرینیش بەجێدێڵێت و بەدوای ڕزگاربووندا دەکەوێتە گەڕان. وەک سواڵکەرێک بە ناوچەکاندا سەفەردەکات، لە هەر شوێنێکیش ناوبانگی دانایەکی ببیستایە، خۆی دەگەیاندێ. هەموو شێوە و تەرزە جیاواز جیاوازەکانی دورەپەرێزی و گۆشەنشینیشی تاقیکردەوە، بەڵام دواتر خۆی سروشی بەرزی بۆهات و ئەوجا ئەو هەقیقەتەی بۆدەرکەوت کە دەمێکبوو بەدویدا وێڵبوو. بودا پەیامەکەی بە شێوەیەکی بێوێنە و میهرەبانانەوە وەک وتاردەرێکی گەڕۆک بڵاودەکردەوە. بودا "واتە کەسێک کە ڕووناک بۆتەوە" خۆی پڕاوپڕ لەسەر ئەو فێرکردنانەی خۆی گوزارشی لێدەکردن دەڕۆیشت

و بە شێوەیەکیش بوو کە بە هیچ جۆرێک باسی خوایەکی تایبەتی یان هەر جۆرە خوایەکی تر نەدەهاتە ناو بابەتەکانیەوە. بودیزم (جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 164) ئاینێکە کە بوونی سەربەخۆی هەیە و پشت بە هیچ هێزێکی باڵا نابەستێت کە جڵەوی جیهانی گرتبێتە دەست، ئاینێکە کە گرنگیەکی دیار بەلایەنی وەک "خود" و "ڕۆح" نابەخشێت، هەر وەک چۆن وێناکردنە دێرینە پیرۆزەکانی تر باسیاندەکرد. ئاینی بودی بوون بە شتێکی بەردەوام دەبینێت؛ هیچ شتێکی جێگیر بوونی نیە، تەنها جۆرە ئازارێک نەبێت کە دێت و دەڕوات و تا ڕادەیەکیش پشت نابەستێت بە هەلومەرجە بنچینەییەکانی بوونەوە (بۆنمونە لەدایکبوون و مردنەوە). بودیزم باوەڕی بە لەدایکبوونەوە و جۆرە بازنەیەکی ژیان هەیە، وە تەنها ئەو کەسانە دەتوانن لەو بازنەیە ڕزگاریان بێت کە دەگەنە نیرفانا "هیچێتی مەزن"، ئەمەش حاڵەتێکی مەزنی بێدەنگییە و ژیان تێیدا لەو پەڕی ئارامیدایە.

(بودا وای دادەنا ژیانی مرۆڤ لە زنجیرەیەکی نەپچڕاوی پرۆسیسی فیزیاوی و ئەقڵی پێکهاتبێت، کە وا لە مرۆڤ دەکات بەردەوام لە چرکەیەکەوە بۆ چرکەیەکی تر بگۆڕێت...
جیهانی سۆفیا، لاپەڕە *290، 405)

### Bohr Niels بۆهر، نیلز

بۆهر "1885 تا 1962" لە ساڵی 1922 دا خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت. ئەم، بە بەراوردکردنی لەگەڵ زاناکانی تری بواری فیزیای ئەتۆمیدا، زیاتر بایەخی بە گرفتەکانی تیۆری زانستیدەدا. لە "وانە ئەتۆمیەکان"یدا، هەوڵیدەدا دەرگایەک لەسەر بابەتێکی هەرە سەرەکی و گرنگ بکاتەوە، چونکە ئەو دێت و پرسیارێک ئاراستەی خۆی دەکات؛ چۆن دەکرێت پێکهاتەکان وە بەتایبەتیش هەقیقەتە متمانەپێکراوەکانی تیۆرییەک، کە بەتەواوەتی پشت بە شتێکی نەبینراو دەبەستن _لێرەدا تاڕادەیەک تیۆریە ئەتۆمیەکانیش دەگرێتەوە_ بگاتە ئاستێک کە لە جەوهەرەوە بە ئاشکرایی ببینرێت؟ بۆهر گەشەی بە چەمکی "تەواوکەر = متمم لەفیزیادا" دا و لێرەشەوە ئاماژەی بۆ پەیوەندیە ناوەکیەکانی نێوان لێکدژەکان دەکرد .

(دەڵێن زانای فیزیاوی دانیمارکی نیلز بۆهر ناڵێکی ئەسپی بەسەر دەرگاکەی دەرەوەیاندا هەڵواسیبوو... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 393)

### Beauvoir، Simone De بیوڤوار، سیمۆنە دی

زۆرجار، بە تایبەتیش لەلایەن هاوەڵە پیاوەکانیانەوە، بیوڤواری هاوسەری ژیانی جان پۆل سارتەری فەیلەسوفیان وەک کلکی سارتەر لە قەڵەم دەدا، بۆ نمونە بە شێوەیەکی زۆر دڵڕەقانە ناویان نابوو "تێبینی نووسەکەی سارتەر". بەهەرحاڵ دواتر ڕەخنەلێگرانی ناچاربوون، بەلایەنی کەمەوە تاڕادەک، چاوێک بەسەر حوکمە بە پەلەکەیاندا بخشێننەوە، چونکە سیمۆنە دی بیوڤوار "1908 تا 1986" نیشانیدا کە خاوەنی کەسایەتیەکی سەربەخۆیە. سیمۆنە بەردەوام لایەنی باشی جیهان بینینێکی واقیعی وەبیری سارتەر دەهێنایەوە، وە لە ڕێگەی ڕەخنە و سەرنجە فەلسەفیەکانیەوە کەمێک سارتەری ناوبەناو بەرزفڕی هاوەڵی، دەهێنایەوە سەر زەوی. لە فەلسەفەی تایبەت بە

خۆشیدا، سیمۆنەی نووسەر بەبەردەوامی پشتگیری کێشەی ئافرەتانی دەکرد و نەیدەویست هەروا بە ئاسانی جێیبهێڵێت بۆ گروپ و تاقمە فیمینیستەکانی تر؛ ئەو دەیگوت "نابێت هەروا بە ئاسانی بڕوابکەین کە لەشی مێینە جۆرە سروشێکی نوێی جیهانبینی بە مرۆڤ دەبەخشێت. ئەمە بێ مانایە. ئەو ئافرەتانەی بڕوا بەمە دەکەن، لە نائەقڵانیەت و نادیاری و گاڵتەجاڕیدا دەمێننەوە، وە هەمان ئەو ڕۆڵە دەبینن کە پیاوان هەیانە."

(سارتەر زۆر دەچووە قاوەخانەکان و لە یەکێکی وەک ئێرەدا چاوی بە سیمۆنە دی بیوڤواری هاوسەری ژیانی کەوت... جیهانی سۆفیا لا.488*، 492)

**Bőhme، Jakob بیوهمە، یاکۆب**

پیشەی بیوهمە "1575 تا 1624" پێنەچێتیبوو، بەڵام لەهەمانکاتدا پیاوێکی ڕۆحانی ئەڵمانیبووە و ئەندێشە قوڵەکانی یان دەرنەدەبڕی، یان لە ڕێگەی زمانێکی وێنەیی ئاڵۆز و نادیارەوە دەیخستنەڕوو. بەلای بیوهمەوە هەموو شتێک پەیوەندی بە یەکێتیەکی موتڵەقی خوایانەوە هەیە و تەنها لەو شوێنەدا هەستپێدەکرێت کە لێکدژەکان پەیوەندیەکی ئاڵوگۆڕیان لەگەڵ یەکتردا هەیە. لێرەشەوە تێگەیشتنی فاکتۆرە گرنگەکانی بوون، لەڕاستیدا تەنها لەڕێگەی لێکدژەکانیانەوە ئاشکرادەبێت؛ بۆ نمونە، ڕووناکی بەهۆی تاریکیەوە خۆی نیشاندەدات، یان بۆ ئەوەی شتە باشەکان بەڕاستی باشبن، پێویستیان بە شتە خراپەکانە. لەم ڕوانگەیەوە تەنانەت خواش بەستراوەتەوە بە زنجیرە لێکدژێکی بێکۆتاییەوە؛ تەنها ئەو کاتە خوا دەتوانێت بجوڵێتەوە و لە شوێنە بەرز و سەنگینەکەیەوە دەرکەوێت، کە بواری بۆ بڕەخسێت لە شتێکی تەواو جیاوازدا خۆی نیشانبدات و خۆی بنوێنێت.

(لێرەدا ڕۆمانسیەکان نەک هەر دەگەڕانەوە سەر سپینۆزا، بەڵکو دەگەڕانەوە سەر پلۆتین و فەیلەسوفەکانی ڕێنیسانسی وەک یاکۆب بیوهمە و... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە، 372)

**Bacon، Francis بەیکۆن، فرانسیس**

بەیکۆن "1561 تا 1626" لە سەر ئاستی دەوڵەتدا چەندین پلەوپایەی بەرزی هەبووە، هەروەها کاتێکی باشیشیان خستبووە بەردەست کە خەریکی نووسینە فەلسەفیەکانی بێت. ناواخنی هەموو کارە فەلسەفیەکانی سەبارەت بە خستنەڕووی یەقینێکی نوێبوو؛ ئەم دەیگوت تەنها ئێستاکە مرۆڤ پێیناوەتە سەر ئەو ڕێگایەی کە بەرەو زانیاری و زانستی دەبات، وە هێشتام دەتوانن بە زۆر شتی تریش بگەن، لە ڕاستیدا هەر زۆر زۆر شتی تریش ... بەرزترین پلەی ڕامیاریشی ئەو کاتە بەدەستیهێنا کە "جیمس ئای" وەک سەرۆکی گشتی داد دایمەزراند، بەڵام سێ ساڵ دواتر "لە ساڵی 1621" هەم ئەم پلەیە و هەم هەموو پلەوپایەکانی تریشی لەدەستدا، لەبەرئەوەی بە تاوانی بەرتیلخواردن تاوانباریان کرد. وەک فەیلەسوفێکیش بەلای بەیکۆنەوە گرنگبوو کە بە شێوەیەکی ئارام و بەبێ هیچ پێشداوەریەک بڕوانینە هەقیقەت، ئەمەش وەک بنچینەیەکی گەیشتن بەو

زانیاریە دادەنێت کە مرۆڤ پێشدەخات. بەبڕوای ئەم مرۆڤ بە پێچەوانەی خوداوە (کە خۆشبەختانە ئەم گرفتەی نیە؟) بەردەوام شیاوی ئەوەن بە هەڵەدابچن و بە هەڵەش شتەکان هەڵبسەنگێنن. بەیکۆن لە کتێبی "میتۆدی زانیاری نوێ "دا بە قوڵی دەچێتە ناو بابەتی "خەیاڵی خاو"ەوە، لەم کتێبەدایە کە ڕێگاچارەیەک بۆ چۆنیەتی خۆدورخستنەوە لە سەرلێشێوان و حوکمی پێشتر دەخاتەڕوو.

(فرانسیس بەیکۆنی فەیلەسوفی ئینگلیزی دەیگوت؛ "زانین دەسەڵاتە"... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 217*، 236)

### پارمێندیس Parmenides

پارمێندیس "نزیکەی 515 تا نزیکەی 450 ی پێش مەسیح" خەڵکی کۆلۆنی "ئیلیا"ی یۆنانی بوو کە دەکەوتە خواروی ئیتاڵیاوە، ئەوکاتە کۆلۆنی ئیلیا شوێنێکی نایابووبۆ سەرهەڵدانی فەیلەسوفەکان. پارمێندیس قوتابخانەی ئیلیاتی دامەزراند و لەلایەن "زینۆن" و "میلیسۆس"ی قوتابییەوە بەردەوامی پێدرا، ئەم قوتابخانەیە وەک یەکەیەکی داخراو باس لە ڕاستی دەکات، وەک شتێک کە زۆربەی کات شیاوی ئەوەبێت لەڕێگەی بیرکردنەوەوە ئاشنای ببین. زانیارییەکی زۆرمان سەبارەت بە پارمێندیس لە بەردەستدا نییە، بەڵام لە بەرامبەردا هەندێک لەو نووسینانەی بە ناوی ئەوەوە نووسراونەتەوە، ماون؛ بۆ نمونە بەشێکی دوورودرێژی هۆنراوەیەکی بە ناوی "سەبارەت بە سروشت" پارێزراوە، لەوێدا وەسفی ڕێگای زانین دەکات و بە سەفەرێک بەرەو هەقیقەت دەیشوبهێنێت. ئەو سەفەرە بە پێشەکییەک دەست پێدەکات؛ پارمێندیس سواری گالیسکەیەک دەبێت کە چەند ئەسپێک ڕایدەکێشێت و بە ڕێگای زانیندا بەرەو خۆر دەیبەن، لەوێدا خواژنێک لە پێشدا باسی "ڕاستیترین ڕاستی" بۆ دەکات، پاشان باسی بیروبۆچوونە بێمتمانەکانی مرۆڤی سەر زەوی بۆ دەکات. مرۆڤی سەر زەوی باوەڕ بەو شتانە دەکەن کە دەیانبینن؛ بەردەوام هەستەکانیان هەڵیاندەخڵەتێنن، سەرنج دەخەنە سەر جیاوازییەکان و لێکدژەکان، بەڵام وەک ڕاستی دایاندەنێن، بۆ نمونە ڕووناکی و تاریکی، جوڵاندنەوە و جێگیربوون. لێرەشەوە مرۆڤ، وەک سەرئەنجامێک، لەوبڕوایە کە لێکدژەکان ڕێک بە تەنیشت یەکەوە بوونیان هەبێت. بەڵام "ڕاستیترین ڕاستی" ئەوەیە کە هەموو شتێک بەشێوەیەکی سەربەست خۆی بۆ خۆی بوونی هەیە، وە یەکەیەک پێکدەهێنێت، کە هیچ جۆرە جیاوازییەکی تێدا نییە و بەتەواوەتیش هەتاهەتاییە؛ "واتە بوونی ڕابووردویان وەک داهاتوویان دەبێت، چونکە لە یەکەیەک پێکهاتوون کە هەمان پێکهاتەی هەیە". بەپێی پارمێنیدیس ئەم ڕاستییە نائاشکرایە لە ڕێگەی ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەوە ("بەڵام بیرکردنەوە لەگەڵ ئەو شتەی کە بیری لێدەکرێتەوە هەمان شتن") سەلمێندراوە کە هەمیشە سەبارەت بە شتێکە کە بوونی هەیە. واتە بیرکردنەوە لە شتێک "کە بوونی نییە" لە بنەڕەتدا مانای ئەوە دەبەخشێت کە بیرنەکەیتەوە، لێرەشەوە لەڕاستیدا بوونی نییە. ئەم فەلسەفە تایبەت و سەرنجڕاکێشە، کە پاشتر کاریگەری خۆی لەسەر چەندین بیرمەند بەجێهێشت (بۆ نمونە پلاتۆن و هیگڵ و نیتشە)، هەوڵ و تەقەلایەکی زۆری پارمێندیسمان بۆ دەردەخات؛ ئەو دەیەوێت "بیرکردنەوە" بخاتە ناوەڕاستی هەموو ئەو ڕاستییانەی کە بە ئاشکرا وەک شەپۆلی ئاوێک دیارن کە کەمخایەنن و دەیانکاتە بەردێکی گەورەی قەراغ دەریا. لەلایەکی تریشەوە نووسینەکانی

شێوەیەک لە پێشبینیکردن و زمانێکی وتاری لە خۆگرتووە، ئەمەش وایان لێدەکات وەک "هەقیقەتێکی شاعیریانە" دەرکەون؛ "جگە لەو بوونانەی کە ئێستاکە هەن، هیچ جۆرە بوونێکی تر بوونی نییە، وە لە داهاتووشدا هیچ بوونێکی تر سەرهەڵنادات؛ چارەنووسیش وادەخوازێت کە تەواو و سەقامگیربن". کەواتە هەموو ئەو شتانەی کە مرۆڤ (هەڵبەتە وەک بوونەوەرێک کە شیاوی مردنە) لە ڕێگەی زمانەوە جێگەی بۆ کردونەتەوە، تەنها ووشەیەکی بەتاڵن و هیچی تر، وە هۆی بڕواکردن بەو ووشانەش لە بنچینەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەم بۆچوونانە؛ "سەرهەڵدان" و "فەوتاندن"، "بوون" و "نەبوون"، "گۆڕانکاری هەمیشەیی و بەردەوام" و "ڕوونی ڕەنگەکان".

(بەپێی پارمێندیس هەرچی شتێک کە بوونی هەیە، هەمیشە بوونی هەر هەبووە... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 44*، 50، 54، 360)

### Pantheism پانتیزم

بیرۆکەی هەرە بنەڕەتی پانتیزم دەڵێت خودا لە ئافەریدەکانی جودا ناکرێتەوە. بیری خودا لە هەموو شتێکدا بەشدارە، لەگەڵ هەموو بیرکردنەوەیەکدا تێکەڵە، لەگەڵ هەموو سروشتدایە، ئەم لایەنە تەنانەت مرۆڤیش دەگرێتەوە کە شوێنێکی گەورەی لە بووندا داگیرکردووە. بەڵام ئەگەر هەموو شتێک خودا بێت، کەواتە دەتوانین پرسیارێک بوروژێنین؛ ئایا خودا تەنها بووە بە هەموو شتێک و چیتر خودا نییە؟ لێرەشەوە دەتوانین بڵێین ئەم ووشانەی خوارەوەی شۆپنهاوەری فەیلەسوف بڕێک ڕاستی زۆری لەخۆگرتووە؛ ئەو دەیگوت "پانتیزم شێوەیەکی نایابی خوانەناسیە."

(زۆربەی خەڵکیش لەو بڕوایەدابوون خودا لەناو سروشتیشدا بوونی هەبێت... بەم جۆرە تێگەیشتنەش دەگوترێت "پانتیزم"... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 164، 215*)

### Paulus، Apostel پاولۆس، ئاپۆستیل

دەڵێن "ساولۆس"ی هەڵگری ئاینی مەسیحی کاتێک بەرەو شام ڕۆیشتووە، مەسیح لە دیدەیەکیدا خۆی نیشانداوە. "ئەپۆستیل" (یەکێک لە 12 یارەکەی مەسیح بوو) لە باسەکانیدا سێ کەڕەت باسی ئەم ڕووداوە دەکات. دواتر ساولۆس کوڕێکی بوو و ناوی نا پاولۆس، ئەمیش لەسەرەتادا زۆر بەتووندی دژی مەسیحییەکان بوو، بەڵام پاشان گۆڕانکاری بەسەرداهات و بوو بە یەکێک لە ووتاربێژە هەرە بەتوانا و بەهرەمەندەکانی ئاینی مەسیحی. پاولۆس "نزیکەی ساڵی 10 تا دەوروبەری ساڵی 67" زانستی تیۆلۆژی ئاینی یەهودی خوێند، بێگومان ئەمەش شارەزاییەکی زۆری سەبارەت بە کون و کەلەبەری بڕوا پێشینەکەی پێبەخشی، هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بوێرێت پشت بە ئاینێکی لەڕەگەوە جیاوازی وەک مەسیحی ببەستێت. پاولۆس کوێرانە لەسەر ڕێگای باوەڕی پەیماننامەی کۆن نەڕۆیشت، بەڵکو وێرای لەسەر ئەو ڕێگا نوێیە بڕوات کە مەسیح دەستی پێکرد. ئەو کەسەی، "یەکەمین کەس لە ناو مردووەکاندا"، کە "منی خۆشویست (پاولۆس) و خۆی کردە قوربانیم"، لەناو مردووەکاندا بەو مەبەستە زیندووبۆتەوە کە مرۆڤایەتی بخاتە سەر تەنها ڕێگای هەقانی و پیرۆزی کۆبونەوە لەگەڵ خوادادا. ئەم حوکمە پێشوەختە توونڕەوەی باوکی نەهاتە دی، چونکە کوڕەکەی جۆرە

تەبابوونێکی ئەنجامدا. ئەم پەیامەش پێویستی بە باوەڕێکی پڕاوپڕ و تەواو هەیە. تەنها ئەو کەسە شایانی بەخشینە، کە بەبێ هیچ مەرجێک پێشوازی لە بەخشینی مەسیحی خوا دەکات. پاولۆس رۆڵێکی کاریگەری لە بڵاوکردنەوەی ئاینی مەسیحیدا بینی. هونەری ڕەوانبێژییەکەی کاریگەری خۆی هەم لەسەر ئەو کەسانە جێدەهێشت کە بڕوایان پێدەکرد و هەم لەسەر ئەوانەش کە بڕوایان پێنەبوو، ئەمەش بەتایبەتی دەگەڕێتەوە بۆ زمانە وێنەییەکەی، بۆ نمونە دەڵێت؛ "هەموو شتێک تاقیبکەرەوە و شتە هەرە باشەکان لای خۆت بهێڵەوە"، ئەم وتەیەی ئەو کاتەش ڕاستە گەر بمانەوێت لە ڕێگەی مێژووی فەلسەفەوە، فەلسەفەیەکی تایبەت و سەربەخۆ هەڵبچنین .

(پاش چەند سەدەیەک "پاولۆس"، شاگردەکەی مەسیح، لێرەدا وەستا و باسی مەسیح و ئاینی مەسیحیەتی بۆ ئەسینایییەکان دەکرد... جیهانی سۆفیا لاپەڕە 84*، 172، 182، 190، 265،274)

## Protagoras پرۆتاگۆراس

پێدەچێت پرۆتاگۆراس "نزیکەی 485 تا نزیکەی 415 ی پێش مەسیح" یەکەمین فەیلەسوف بووبێت کە داوای ناونیشانی کاری "سۆفیست"ی کردبێت، کە هەتاوەکو ئەم سەردەمەی ئەمیش هێشتام هەر ناوێکی باشیان هەبوو. سۆفیستەکان (سۆفیست؛ ووشەیەکی یۆنانییە، واتە مامۆستا، هونەرمەند) سەفەریان بەملاولادا دەکرد و وانەی ئاکار و ڕەوانبێژییان دەگوتەوە. ناوی سۆفیست لەو کاتەوە زڕا کە سوکرات و پلاتۆن وێنەی سۆفیستیان لە فەلسەفەکەیاندا بەکارهێنا. لە وێدا وەک مرۆڤی وەڕستکەر و کەللەڕەق وەسفیاندەکەن؛ کەسانێکن ئارەزووی گێژاوی زمانبازی (مراوەغە) دەکەن، لەبەرئەوە بەلایانەوە ئاساییە کە فرت وفێڵ بەکاربهێنن. بەڵام بەپێی هەندێ گێڕانەوەی تر پرۆتاگۆراس، کە بەناوبانگترین سۆفیست بوو، مرۆڤێکی یەکجار زیرەک و بەڕێزبووە. لەناواخنی فەلسەفەکەیدا باس لە بیرۆکەیەکی ڕێژەیی دەکات، وە لە ڕێگەیەوە ئەرکی دۆزینەوەی پێوانەیەک بۆ بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتی مرۆڤ دەخاتە سەر شانی مرۆڤ خۆی، بۆ ئەم مەبەستەش هیچ کەسێک ناتوانێت یاریدەت بدات، تەنانەت خواکانیش ناتوانن. پرۆتاگۆراس لە بارەی خواکانەوە دەڵێت؛ "من هیچ شتێک سەبارەت بە بوون و نەبوونی خواکان نازانم، نەدەشزانم لە ڕاستیدا چین؛ چونکە پەیبردن بە شتێکی ئاوها چەندەها ڕێگری لەبەردایە؛ جگە لەوەش ئەم بابەتە ئاڵۆزە و ژیانی مرۆڤیش کورتە". هەرچەندە هەقیقەتەکان شتێکی ڕێژەیین و خۆمان دەستنیشانیان دەکەین، بەڵام لەگەڵئەوەشدا پرۆتاگۆراس جەخت لەسەر شێوە ڕێکوپێکیەکی کۆمەڵگا دەکات؛ "گەر وڵاتێکی باش و هاوبەشییەکی ڕێک وپێکمان هەبێت، ئەوا دەتوانین بڵێین ئەمە خۆی لە خۆیدا بەهایەکی تایبەتی هەیە و نابێت هەروا کوێرانە ڕەخنەی لێبگرین."

(پرۆتاگۆراسی سۆفیست دەیگوت مرۆڤ پێوانەی هەموو شتێکە... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 73)

## Platon پلاتۆن

پلاتۆن "427 تا 347 ی پێش مەسیح"ی فەیلەسوف بە شێوەیەکی یەکجار تایبەتی سوپاسی سوکراتی مامۆستا و فەیلەسوفی کرد. پلاتۆن ئەوی کرد بە جۆرە کەسایەتییەکی ئەدەبی ئاوها کە بتوانێت خۆی لە پشتەوەیدا بشارێتەوە. واتە لەڕاستیدا بەشێکی ئەو حیکمەتەی بەناوی سوکراتەوە نووسراوەتەوە، دەبێت بە ناوی پلاتۆنەوە گرێبدرێتەوە. ئەو وەک کەسێک بوو کە میراتی فەلسەفی جێبهێڵێت و لە هەمان کاتیشدا میراتیە جێهێڵراوەکەی خۆی وەرگرێتەوە. پلاتۆن لە خێزانێکی ئەرستۆکراتیدا لەدایک بوو، وە هەندێ لایەنی ئەرستۆکراتیش لە فەلسەفەکەیدا دەردەکەوێت؛ لە فەلسەفەکەیدا بڕوایەکی کەمی بە خەڵک هەیە، بەڵام لە بەرابەردا بڕوایەکی زۆر بەرامبەر بە دەستەی هەڵبژاردەی فەیلەسوفەکان نیشاندەدات. دەڵێن لە ساڵی 407 دا بە سوکرات ئاشنابووە، یەکێک لە مێژوونووسە فەلسەفەیە کۆنەکان دارشتنێکی جوانی دەربارەی ئەو یەکترناسینە نووسیوە؛ "دەڵێن سوکرات خەونێکی بینیوە؛ لە خەونیدا بەچکە قوویەک (قوو؛ قازێکی سپی گەورەیە) لەسەر کۆشی بووە، بەڵام لە پرێکدا پەری لێڕواوە و توانایویەتی بفرێ، ئەوجا بەرەو ئاسمان فریوە و دەنگێکی خۆشی لێبەرزبۆتەوە. ڕۆژێک دوای خەونەکەی پلاتۆنیان پێناساندووە؛ دەڵێن لەگەڵ بینینی پلاتۆندا گوتوویەتی ئەمە باڵندەکەی ناو خەونەکەمە...". بێگومان پلاتۆنی باڵندە ئەو کاتە هێشتام بەتەواوەتی نەیدەتوانی بفرێت، بەڵام هاوکات هەوڵیدەدا شیعر بنووسێت و هەندێ هۆنراوەی جوان و ئاڵۆزی سەردەمەکەی دەنووسی؛ " ئەستێرەکەم، تەماشای ئەستێرەکانی سەرەوە بکە. ئاخ، خۆزگە هەزار چاوم دەبوو/ ئاسمان، ئەو کاتە بە هەموویان تەماشام دەکردیت". ئەوجا سوکرات (کە بەنەرمی دەیدوان و بە باشترین قوتابی خۆی دادەنا) بەڕاستی ئەندێشەی قووڵی تێدا ڕواند؛ بەمەبەستی فێربوون دەستی بە سەفەرکرد. لە ساڵی 387 دا چوو بۆ سیسیلیا، لەوێدا تێکەڵی کاری ڕامیاریبوو و پاشان بوو بە ڕاوێژکاری پاشای ستەمکار دیۆنیسیۆسی گەورە. پلاتۆن هەوڵیدەدا جۆرە ڕووپۆشێکی فەلسەفی بەسەر دەستەی دەسەڵاتدا بکێشێت، بەڵام سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. گەڕایەوە بۆ ئەسینا و قوتابخانەیەکی فەلسەفی تایبەت بە خۆی دامەزراند (ئەوەی کە پێی دەڵێن ئەکادیمی)، لەوێدا نزیکەی 40 ساڵ چالاکبوو. پلاتۆن چەند قوتابیەکی گرنگی هەبوو، گرنگترینیان ئەریستۆتالیس بوو، هەرچەندە دواتر نەبووە جێهەڵگری مامۆستاکەی. پلاتۆن دوو کەڕەت دەستی لە وانە گوتنەوە و خوێندنە فەلسەفییە ئارامەکەی هەڵگرت. حەزێکی سەرچڵی گرتی، لەوانەشە پەرۆشی زانین بووبێت و ویستبێتی بابەتێک تاقیبکاتەوە؛ ئەگەر سیاسەتمەندان فەلسەفە بخوێنن و ببنە فەیلەسوفێکی باش، بڵێت ئەوکاتە نەبنە سیاسەتمەندێکی باشتر؟ بۆ ئەوەی ئەم بیرۆکەیەی بە کردار تاقیبکاتەوە دیسانەوە سەفەریکردەوە بۆ سیوراکس و هەوڵیدا بەلایەنی باشی کاریگەری لە دیۆنیسیۆسی بچوک (کوڕی ستەمکار) و دیۆنی زاوای بکات ـ دیسانەوە ئەم کارەشی ئەنجامێکی خۆشبەختانەی پێ نەبەخشی. بەو شێوەیە پلاتۆن لە کۆتایدا ناچارانە گەڕایەوە سەر تیۆرییەکەی و ئیدی بڕوایەکی پتەوی پێبەخشی.

چەندین نووسینی فەلسەفی پلاتۆنمان بۆ ماوەتەوە، لەوانە 25 دیالۆگ و 13 نامەی فەلسەفین (ئێستاکە ڕاست و دروستیان لە ژێر مشتومڕدایە). لە زۆربەی دیالۆگەکاندا سوکرات ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت و ئەو هەقیقەتانە دەڵێت کە پلاتۆن دەیخاتە سەر زمانی. سوکرات میتۆدێکی تایبەتی بەکاردەهێنێت کە لە ئایرۆنی و دیالێکتیک پێکهاتووە. ئەو دەیەوێت زانین وەک شتێکی ئامادەکراو نەخاتە بەردەست، بەڵکو

گەرەکیەتی کاری بۆ بکەین، واتە دەخوازێت لە ڕێگەی بیرکردنەوەوەی خۆمانەوە پێی بگەین.
بیرکردنەوە وەک هونەرێکی "پوختەکردن و کورتکردنەوە" دادەنرا. بەشێوەیەکی مەبدەئیش بیرکردنەوە لە لایەنە ڕووکەشەکان تێدەپەڕێت و ئاماژە بۆ ئەو لایەنە گرنگانە دەکات کە جێگیرن و بەردەوامی بە دیاردەکان دەبەخشن. ئەم شێوە کارکردنە لەسەر مەعریفەت بەتەواوەتی لە تیۆری "بیر"دا هاتووە، لە ڕاستیدا تیۆری "بیر" بنچینەی فەلسەفەی پلاتۆن پێکدەهێنێت. "بیر"ەکان، وێنە و فۆڕمی بنەڕەتی دیاردەکانن و بەشێوەیەکی سەربەخۆ بوونیان هەیە و پەیوەستی ئەم جیهانە نین، هەرچەندە، گەر بەناچاریش بێت، پەیوەندیان بە جیهانەوە هەیە، ئەگەر نا، ئەوا هیچ جۆرە هەقیقەتێک و زانیارییەکی گرنگی پێنەدەبەخشین. مرۆڤ توانای پەیبردنی شتەکانی هەیە، چونکە زانینی شتێک، وەک یادوەرییەکی هەمیشەیی، بەشێکە لە "جیهانی "بیر". بەم شێوەیەش، بەهۆی نزیکی جیهانی "بیر"ی پڕ لەنهێنیەوە، هەمیشە لەو شتانەی کە هەستدەکەین دەیانزانین، زۆر زیاتر دەزانین؛ بەو پەڕی پەرۆشییەوە، بەبێ ئەوەی وەک پێویستییەک بەئاگابین لە جیهانی "بیر"، ڕوو دەکەینە جیهانی مەزنی "بیر". خودی "بیر"ەکان، وەک هەموو شتەکانی سەر زەوی، بەهای جیاواز جیاوازیان هەیە. بیرە "جوانەکان و باشەکان" بالاترین شێوەی "بیر"ن. ڕۆحی نەمری مرۆڤ لەم شێوە "بیر"ەوە سەرچاوە دێنێت، ئەو ڕۆحە نەمرەش پێش ئەوەی بێتە ناو جەستە و جیهانی مادییەوە، ئاشناییەکی تەواوی جیهانی "بیر" بووە، هەر لەبەرئەمەشە کە ڕۆح ئەرکی یادوەری لەدەستگرتووە. ژیان بەسەربردن بەپێی "بیر"ەکان واتای هەوڵدانێک بۆ گەیشتن بە زانینێکی پڕاوپڕ و بالا دەبەخشێت. هێزی بنەڕەتی ئەو هەوڵدانەش "ئیرۆس"ە (*واتە خۆشەویستی.و)؛ ئیرۆس پەیوەندییەکی کەمی بە خۆشەویستی زەمینییەوە هەیە، بەڵام لە بەرابەردا پەیوەندییەکی مەزنی بە خۆشەویستی لایەنە نەمرەکانەوە هەیە. ئەو کەسەی دوای ئیرۆس دەکەوێت، ژیانێکی باش بەسەردەبات، ژیانێک کە بەپێی هاوسەنگی نێوان ئاسوودەیی تایبەتی تاکە کەس و پەیوەستبوونی بە یاسایەکی ئەقڵانییەوە دەڕوات. لایەنە باشەکان (بۆ نمونە هەقانییەت، دانایی، دلێری و هێمنی) پەیوەندییەک لە نێوان زانین و توانای تاکەکەس و ولاتدا دەخولقێنن، ولاتیش پێ بەپێی باشییەکان، لە لایەن چەند چینێکی دیاریکراوەوە دەپارێزرێت؛ گرنگترین چین (گوێبگرە و سەرسام بە!) فەیلەسوفەکانن. ئەوان نمونەی حیکمەتێک نیشاندەدەن کە هەروا بەئاسانی لە ئاسمانەوە نەکەوتۆتە کۆشیانەوە، بەڵکو لە ڕێگەی خوێندنێکی دورودرێژ و پێویستەوە بەدەستیان هێناوە. فەیلەسوفەکان بە شێوەیەک پەروەردەکراون کە ببنە فەرمانڕەوا، بەڵام هەڵبەتە پێویستییان بە چەند هاوکارێک دەبێت؛ پیشەساز و جوتیاری سەرڕاست، کە دەبێت پێویستییە مادییەکانی کۆمەڵگا دابینکەن. شەڕکەران، کە بەبێ هیچ دوودڵییەک دەبێت پارێزگاری ولات بکەن. وە (بە تایبەتیش) پێویستیان بە کۆیلەکانە، کە دەبێت کارە قورس و ناقۆلاکان ئەنجامبدەن. کاتێک پلاتۆن فەیلەسوفەکان دەکاتە فەرمانڕەوا، بەلایەنی کەمەوە لەسەر کاغەز، ئەوا دەکرێت ئەم بیرۆکەیەی وەک کاردانەوەیەکی خۆی لێکبدرێتەوە؛ بەهەرحاڵ نەیدەویست کردارەکەی سیسیلیای بەبەڵگەوە ڕەتبکاتەوە، بەڵکو بە شێوەیەک دووپاتی دەکردەوە وەک ئەوەی لە پرێنسیپێکی دڵنیای فەلسەفییەوە هەڵقولابێت ـ چونکە وەک دەزانین لە فەلسەفەدا ڕێیتێدەچێت لایەنێکی کرداری بکرێتە تیۆری. فەیلەسوف وەک فەرمانڕەوا، وێنەیەکی

بێپەروایە و شیاوی ئەوەیە پێی پێبکەنین. هەر ئەو ڕاستییەی کە دواتر هیچ فەیلەسوفێک پەیدا نەبوو کە بیەوێت لە وڵاتێکی فەلسەفیدا بژی، هەروەک ئەوەی پلاتۆن بیریلێدەکردەوە، نمونەیەکی نایابی ئەو نەخشەیەمان بۆ دەردەخات. پێدەچێت وڵاتێکی بەو جۆرە لە وڵاتێکی ئاسایی توندوتیژتر بەڕێوەببرێت. لە لایەکی تریشەوە دەبێت بڵێین پلاتۆن و هەموو فەلسەفەکەشی نابێت ناوبانگ بەوە دەربکات کە مەزاج و زەوق و خۆشیان دۆزیبێتەوە؛ چونکە پلاتۆن دەیگوت "پێکەنینی زۆر ناشیرین و ناپەسەندە"، وە خۆی پراوپڕ پەیڕەوی وتەکەی دەکرد. لایەنی فەلسەفەی رامیاری پلاتۆن پەسەندنەکرا، بەڵام تیۆری "بیر"ەکانی تاڕادەیەک بەئاسانی بەدرێژایی مێژوو خۆی ڕاگرتووە. ئەم تیۆرییەی، کە خۆی لە خۆیدا نەگۆڕە، لەسەر بنەمایەکی یادوەریی نەگۆڕ مشتومڕی خۆی هەڵدەچنێت کە دەکرێت هەمووان بەشێکی پێکبهێنن. حیکمەتی تیۆرییەکەی بەردەوام دەنگی خۆی لە خواستێکی هەمیشە نایابدا دەردەخات؛ خواستێک کە دەڵێت لەوانەیە شتێک، بەڵکو هەموو ئەو شتانەی کە کاتێک لە کاتەکان بە شتێکی بەنرخ لەقەڵەم دراون، ڕێیتێبچێت بمێننەوە. دەشێت ئەم بیرۆکە پەیوەستە بە خەیاڵی کەسێکی ڕیالیستیکی توندڕەویشدا گوزەربکات؛ "وەک پریشکێک کە لە ئاگرێکەوە جودا دەبێتەوە، لە پرێکدا ڕووناکییەک لەناو ڕۆحدا لەدایک دەبێت و دواتریش خۆی خۆی پێدەگەیێنێت". پلاتۆن وەک شاعیرێک، کە هەروەک پلاتۆنی فەیلەسوف زیرەکبوو، لێرەدا وەک دڵنەواییەک، یادێک سەبارەت بە کۆتایی هاتن دەبەخشێتە پلاتۆنی فەیلەسوف، هەرچەندە کۆتایی، کۆتایی نییە؛ "جاران وەک ئەستێرەی بەیانیان لە ناو زیندووەکاندا دەدرەوشایتەوە، ئێستاکەش لە مردندا وەک ئەستێرەی شەوان لەناو مردووەکاندا دەدرەوشێیتەوە ".

(هەرچی دەربارەی ژیانی سوکراتە، بە پلەی یەکەم لە ڕێگەی پلاتۆنی قوتابیەوە دەیزانین و خۆشی پاشان بوو بە یەکێک لە فەیلەسوفە مەزنەکانی مێژوو... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 71، 74*، 86، 87، 88، 111، 115، 122، 126، 135، 137، 139، 145، 161، 165، 171، 177، 183، 185، 188، 192، 193،219، 246، 249، 252، 253، 274، 278، 315، 388، 421، 437، 537)

### Plotin پلۆتین

لە پێش سەدەی سێهەمی پاش مەسیحدا ئیمپراتۆری ڕۆمانی شەکەت و ماندووی قەیران و هەڵوەشاندنەوە بوو، بەڵام لە سەدەی سێهەمەوە فیکری یۆنانی سەریهەڵدا، لەگەڵ خۆیدا هەموو تەم و مژێکی پاککردەوە و لەبری وان ڕێز و بەهایەکی نوێی هێنایە کایەوە. لێرەوە ئەو ماوەیە دەستیپێکرد کە بە هیللینیزم ناسراوە، پلاتۆنیشیان بە یەکەمین و گەورەترین بیرمەندی خۆیان دادەنا. ئەو فەلسەفەیەش کە خەڵکانی بەپەرۆش و سەرسامبووی ئەو کاتە هێنایانەوە کایە، لەوە بەدواوە وەک پلاتۆنیزمی نۆێ تەماشادەکرێت. ڕابەری پلاتۆنیزمی نوێ ناوی پلۆتین "204 تا 270" بوو، دەڵێن هێندە پەرۆشی ڕۆحانییەت بووە کە شەرمی لەوە کردووە، بەڵکو بەتەواوەتی لەیادیکردووە، کە "خاوەنی جەستەیەکیش بووە". سەردەمی سەرکەوتنی مەزنی پلۆتین لە شاری ڕۆمادا دەرکەوت، ئەو شارەی لە ساڵی 244 وە وانەی تێدا دەگوتەوە، لەوێدا کۆمەڵێک شاگرد لەدەوری خڕبووبونەوە. فەلسەفەی ئەم ڕۆحانییەتێکی زیاتری بە تیۆری "بیر"ی پلاتۆن

بەخشی، بگرە زیاتر بە ئاسماندا بەرزیکردەوە؛ گەردوون لەچەند پلەیەک پێکهاتووە و شوێنی شتە باشەکان لە سەری سەرەوەدایە، لەوێدا "تەنها یەک"ی لێیە کە لەبەر باشییە فراوانەکەی ئەقڵ بەئاسانی ناتوانێت پەی پێبەرێت. تەنها ئەو کاتە دەتوانین لێی تێبگەین کە رێگەی پێدەدرێت بەسەر "سەرچاوەدا" تێپەرێت و خولقێنەربێت، لێرەشەوە دێتە ناو "هزری گەردوونەوە". هزری گەردوونیش رۆحی جیهان دەخولقێنێت (کە پێکهاتووە لە چەندین رۆحی جیا جیا)، وە جیهانی "بیر"یشی لە خۆ گرتووە، ئەو جیهانەی کە لای پلاتۆن راستەقینەترین شوێنی هەقیقەت بوو. مادە لە پلەی خواری خوارەوەی پلیکانەی راستەقینەی رۆحانیدایە و پلۆتین هیچ سوودێکی وای پێنابەخشێت. مادە "شتە خراپەکانن" و بەشێوەیەکی هەتاهەتایی دژی شتە باشەکان دەوەستێت. ئامانجی هەموو زانینێک گەیشتن بە "شادمانییە گەورەیەکەیە"، واتە هەوڵدانێکە بۆ پەیداکردنی وێنایەکی پراوپڕ و دڵسۆزی "تەنها یەک"، ئەمەش شتێکە کە دەکرێت پێیبگەین، بەڵام بەمەرجێک ئاراستەی هەنگاوەکانمان لەسەر پلیکانەی راستەقینەی رۆحانیدا وەرچەرخێنین و بەرەو سەرەوە هەنگاو بنێین، لەکۆتایشدا بە "یەکبوون" دەگەین (تەماشای "میستیک" بکە)؛ یەکبوون لەگەڵ هەرە بالاترین فۆرمدا، ئەمەش خۆی لەخۆیدا مانای خۆشبەختی و شادمانی دەبەخشێت.

(بەپێی پلۆتین جیهان کەوتۆتە نێوان دوو جەمسەرەوە... جیهانی سۆفیا، لاپەرە 145، 146*، 161، 164، 189، 318، 372)

### Thales تالیس

هەندێ کەس دەڵێن مێژووی فەلسەفە لەگەڵ تالیسدا "نزیکەی 624 تا دەوروبەری 547 ی پێش مەسیح" دەستپێدەکات. ئەم بە یەکێک لەوانە دادەنرێت کە بۆ یەکەمین جار (پێدەچێت راست و دروست یەکەمین کەسیش بووبێت) پرسیارە سەختەکانی وروژاند (جیهانی سۆفیا، لاپەرە 23)، ئەو پرسیارانەی تا ئێستاکەش فەیلەسوفەکان دەیکەنەوە ـ لەوانەیە بە پلەی یەکەم لەبەرئەوەبێت کە هێشتام وەڵامەکان بە تەواوەتی پراوپڕنین و تێرمان ناکەن. تالیس، بەدەر لەوەش، یەکێک بوو لەو فەیلەسوفە سەرەتاییانەی کە پێی پێدەکەنین؛ کەسێکی بیربلاوبووە و شتی لەیادکردووە، مرۆڤێکی بێسەروبەر و کەمێکیش سەیربووە ـ لێرەشەوە مەرجە دیار و گرنگەکانی فەیلەسوفی تێدا بووە. تالیس بە شێوەیەکی تایبەتی بڕوای بە کارەکانی خۆی بوو؛ پێشبینی خۆرگیرانەکانی کردووە و دەتوانین بڵێین بە شێوەیەکی گشتیش پێشبینی ئاو و هەواشی کردووە، لەسەرو ئەمانەشەوە زانایەکی ماتماتیکی لێهاتووبووە. بە بڕوای ئەو، مادەی هەرە بنەڕەتی ژیان "ئاو"ە و پێیوابووە زەوی لەسەر ئاو وەستابێت. چەندەها نوکتە لەسەر تالیس دانراوە؛ نوکتەکان تەنها پێکەنیناوی نین، بەڵکو لە هەمان کاتدا گەواهی زیرەکی ئەو مرۆڤە دەدەن؛ بۆ نمونە دەڵێن لێیان پرسیووە؛ "تۆ بۆچی ناتەوێت منداڵت ببێت؟" ئەویش لەوەڵامدا گوتوویەتی "چونکە خۆشم دەوێن."!

(یەکەمین فەیلەسوف "تالیس" مان بەر گوێ دەکەوێت، خەڵکی کۆڵۆنی یۆنانی میلیت بوو لە ئاسیای بچوکدا... جیهانی سۆفیا، لاپەرە 42*، 47، 383)

## Thomas Squinas تۆماس ئەکویناس

تۆماس ئەکویناس "1225 تا 1274" گەورەترین و گرنگترین فەیلەسوفی سەدەکانی ناوەڕاستی دواتر بوو، وەک لەشولاریش مرۆڤێکی قەڵەو بووە (بەپێی وەسفکردنی هەندێک لە کەسانی سەردەمەکەی). لە خێزانێکی بەگزادەی خوارووی ئیتاڵیادا لەدایک بوو. پشتگیری لە سیستمی تازە دامەزراوی دۆمینیکانەکانی دەکرد (*لە ساڵی 1215 دا سیستمێکی قەشەی کاتۆلیکەکان لە سەر دەستی قەشەی ئیسپانی "دۆمینگۆ دی گوسمان"دا دامەزرا.و) و گوزارشی بۆ ئیدیالی دونیا نەویستی دەکرد. بێگومان خێزانەکەی مەزنەیاندەکرد کە پلەو پایەیەکی کڵێسەیی هەبێت، بەڵام بەهیچ جۆرێک پێیان خۆشنەبوو ببێتە قەشەیەکی سواڵکەر (*واتە قەشەیەک کە بۆی نیە خاوەنی هیچ شتێک ببێت و دەبێت لەسەر خێر بژی.و) و دۆمینیکانێک، هەر لەبەر ئەم هۆیەش براکانیان نارد بەشوێنیدا بۆ ئەوەی بیهێننەوە، بەڵام تۆماس نەیدەویست لەگەڵیاندا بگەڕێتەوە، ئیدی براکانیشی کەوتنە بەکارهێنانی شێوازی بەدکاری؛ (دەڵێن) ئافرەتێکی سۆزانیان بۆ بردۆتە ژوورەوە، بەڵام بەپەلە دەرپەڕیوەتەوە دەرەوە، چونکە تۆماسی بابەی کڵێسە بە مەشخەڵێکەوە پێشوازی لێکردوە و داوای لێکردوە بوەستێت، بەو شێوەیەش لایەنێکی پیاوەتی ڕەفزکردووە کە ئافرەتەکە چاوەڕوانی نەکردوە. دواتر تۆماس لە شارەکانی ناپۆلی و پاریس و کیولین و بۆلۆگنا و ڕۆمادا وانەی دەگوتەوە، ئیدی بەبێ وەستان بەرە بەرە ناوبانگی زیاتر بڵاوبووەوە. کڵێسە چاوەڕوانییەکی یەکجار زۆری لەم بیرمەندە دەکرد، بەتایبەتیش لەبەرئەوەی لەلای ئەم بابەتی بڕوا لە "هەموو شتێکی تر گرنگتر" بوو؛ ئەمەش شتێکبوو کە هەر لە زووەوە "ئەلبێرتۆس ماگنۆس، ئەلبێرتۆی گەورە"ی مامۆستای هەستی پێدەکرد. ئەلبێرتۆس ماگنۆس خۆی بەناوبانگبوو، بەڵام لەبارەی قوتابییەکەیەوە دەیگوت تۆماس "گەورەترین" کەسە کە بتوانێت دوو فەیلەسوفە مەزنەکە (پلاتۆن و ئەریستۆتالیس) "یەکبخات". خاسیەتی فەلسەفەی تۆماس لەو نەرمیە گەورەیەیدا دەردەکەوێت کە دەیەوێت بڕوای مەسیحی (سەبارەت بە هەقیقەت) و بیرکردنەوەی ئەریستۆتالیسی پێکەوە گرێبداتەوە. بێگومان بەو شێوەیەش بڕوا لە سەری سەرەوەدا دادەنرێت (ئەو کاتە کڵێسە دەیویست بەو شێوەیە بێت) بەڵام لە هەمان کاتدا ئەقڵیش گرنگییەکی مەزنی هەیە؛ دەتوانێت پەی بە هەموو ئەو ڕاستیانە بەرێت، کە لە سۆنگەی سروشەوە هەڵناقوڵێن و لە ژێر سنووری بڕوادا دەمێننەوە، واتە شتێکی زەمینین بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بوارێکی فراوان پێکدەهێنن. تۆماس پەرەی بە بواری زانستیدا، لێرەشەوە زانست زیاتر دەرکەوت و وەک ئاکامێکی ئەمەش دەرگا لەسەر ناتەبایی لەگەڵ کڵێسەی هەمیشە وریادا ئاوەڵابوو. بەبڕوای تۆماس یەزدان "ئەو شتەیە کە هەیە"، واتە خودی بوونە، دیسانەوە واتە بوونەوەر و بوون یەکن. خودا پڕاوپڕترین بوونەوەرە کە نەک هەر بێئەقڵییە گەر گومانی لێبکرێت، بەڵکو لە ڕاستیدا شیاوی گومانکردنیش نیە، چونکە بوونەوەرێکی پڕاوپڕ هەموو جۆرە خاسیەتێکی لەناودایە، لێرەشەوە هەموو خاسیەتەکانی بوونیشی لەخۆگرتووە ـ دواتر چەند بیرمەندێکی تریش ئەم چەشنە ئیسپاتکردنەی خوایان بەکارهێنا. خودا جیهانی لە "هیچە" ئافەریدەکردووە، وە ئافریدەکانیش بە باشی ڕێکخراون؛ لە پلەی خوارەوە بەرزدەبێتەوە و بەرەو سەروە دەڕوات، لە مادەوە بۆ توخم، بۆ ڕووەک، بۆ ئاژەڵ، بۆ مرۆڤ و فریشتەکان و بەرەو خودا بەرزدەبێتەوە، لەوێدا یەکەمین و باڵاترین بوونەوەر "بوون"ە، وە هەموو ئافەریدەکانی تر تەنها هێندە بوونیان هەیە کە لە ماوەی ژیانە کورتەکەیاندا بەکاریدەهێنن. بە پێی تۆماس فۆرم و مادە لە مرۆڤدا

یەکن وە وا مەزنەدەکات کە "ڕۆح" پرێنسیپی فۆرم داهێنەری لەش و مادە بێت؛ لێرەشەوە خاسیەتە تایبەتییەکانی تاکەکەس پێکدێت. بەڵام بەدەر لەوەش ڕۆحی نەمر کاریگەری خۆی لەسەر توانای پێزانینی مرۆڤ جێدەهێڵێت، چونکە لە ڕێگەی جۆرە "ژیرییەکی هاوبەش"ەوە دەتوانێت سەرنج و بیرکردنەوەکان ڕێکبخات و بەڕێوەیانبەرێت. تۆماس ئەکویناس نووسینێکی یەکجار زۆری لەپاش خۆی بەجێهێشت؛ هەر وەک یەکێک لە قوتابیەکانی دەیگوت خوێندنی سەرجەم نووسینەکانی ئەو کەسە گەورەیە "لە توانای هیچ کەسێکدا نییە "و تەنها دەبێت هەناسەی داخی بۆ هەڵبکێشین. لە ساڵی 1323 دا تۆماسیان وەک کەسێکی ئاینی پیرۆز ناونا؛ وە لە ساڵی 1557 دا نازناوی "باوکی کڵێسە"یان پێبەخشی، وە تیۆریەکەشی "تۆمیسیزم" بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ وەک فەلسەفەی ڕەسمی کڵێسە پەسەندکرا .هەموو نووسینەکانیشی لەبەر چاوی خەڵکانی تردا شتێکی گرنگبوون، بەڵام بەلای خۆیەوە هێندە تایبەتی نەبوون. دەڵێن لەکاتی سەرە مەرگیدا بەم ووشانە کۆتایی بە ژیانی کارکردنی هێناوە؛ "لە توانامدا نەما؛ بەپێی هەموو ئەو شتانەی لە ژیانمدا بینیمن، سەرجەمی هەموو ئەو شتانەی کە نووسیومن تەنها وەک توێکڵە گەنمێکی بێکەڵک وان."

(مەزنترین و گرنگترین فەیلەسوفی سەدەکانی ناوەڕاستی دواتر، تۆماس ئەکویناس بوو... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 193*، 210، 250، 257، 352، 495)

### The Big Bang تەقینەوە گەورەکە

لە ساڵی 1929 دا "ئیدوین هۆبل"ی ئەستێرەناس و زانای فیزیای ئەمریکی لە ئاکاری سەرنجەکانیەوە گوتی گەلەهەسارە دوورەکان لە گەلەهەسارەکەی خۆمانەوە (ڕێی کاکێشان) دووردەکەونەوە، وە هەتاوەکو دوورتربن لێمانەوە بەخێراییەکی زیاتر لێمان دووردەکەونەوە. دوابەودای ئەمەش خاڵێکمان بۆ ڕوونبووەوە؛ گەردوون (بەردەوام) پان دەبێتەوە، دیسانەوە ئەمەش مانای ئەوە دەبەخشێت کە گەلەهەسارەکان لەوەوپێش، لەماوەیەکی زۆر زۆر لەوەوپێشەوە، نزیکبوون لەیەکەوە. لەسەر ئەم بنەمایەش تیۆری "تەقینەوە گەورەکە" هاتەکایەوە. ئەم تیۆریە دەڵێت نزیکەی بیست ملیارد ساڵێک لەمەوبەر گەردوون بەهۆی تەقینەوەیەکی لەپڕەوە سەریهەڵداوە، ئەو تەقینەوەیەی کە پێی دەگوترێت "تەقینەوە گەورەکە". دەکرێت مەزنەی ئەوە بکەین کە هەموو شتێک لەگەڵ تەقینەوە گەورەکەوە دەستیپێکردووە؛ بۆ نمونە شوێن، کات، مادده. ئەم تیۆریە جێگەی مشتومڕە، وە بەشێوەیەکی گشتیش لە زانستی گەردوونزانیدا کەم تا زۆر تەنها بیرکردنەوەی بەبەڵگە یان کەم بەڵگە دەبینین و هیچی تر، چونکە وەک ئاشکرایە لە کاتی سەرهەڵدانی گەردووندا ئێمە بوونمان نەبووە، وە بێگومان ئەو کاتەش بوونمان نابێت گەر لە داهاتوویەکی دووردا گەردوون بوونی نەمێنێت، لەبەرئەوە دەبێت مرۆڤ بەم نەزانینە و چەندەها نەزانینی تریش ڕازیبێت، بەڵام هاوکات دەکرێت فەلسەفە بتوانێت جۆرە دڵنەواییەکمان بداتەوە _هەڵبەتە ئەگەر هەر لە بنەڕەتەوە ئەو توانایەی تێدابێت. هاراڵد فریشی پرۆفیسۆری فیزیای ئەڵمانی بەم شێوەیە گوزارش لە هەموو ئەو زانیاریانەمان دەکات کە سەبارەت بە جیهانی ئەستێرەکانن؛ "دەبێت ئەو ڕاستیە پەسەندکەین کە دەڵێت هیچ جۆرە پێکهاتەیەکمان لە گەردووندا نیە کە نەمر و هەتاهەتایی بێت، بەڵکو هەموو شتێک بەردەوام لە بزاوتندایە. لە دواهەمین ئەنجامیشدا

هەموو پێکهاتەکان هەڵدەوەشێنەوە". (لێرەدا بێگومان دەتوانین بڵێین هیراکلیتی فەیلەسوفی دێرین لەدڵەوە مرۆڤێکی ئاسوودە بووە!).

(ئەو تەقینەوەیەیە کە بە ئینگلیزی پێی دەگوترێت (The Big Bang) واتە تەقینەوە گەورەکە جیهانی سۆفیا لاپەڕە 543)

**Darwin Charles داروین، چارلس**

تەنها سەفەرێک، بەڵام پێنج ساڵی خایاند، بووە هۆی ئەوەی چارلس داروین "1809 تا 1882" جۆرە دیدەیەکی جیهانبینی هێندە نوێ بهێنێتە کایەوە کە هێشتام ئاکاماکانی بە تەواوەتی دیارنین. دارووینی کوڕە دکتۆر لە سەردەمی قوتابخانەیدا نیشانەی هیچ جۆرە زیرەکیەکی تایبەتی پێوەدیار نەبوو، قالۆنچەی کۆدەکردەوە و خولیای باڵندەناسی بوو، بەڵام زۆرجاریش خۆیدەدایە دەست خەیاڵی خۆی و ئیدی نەیدەزانی خۆی لە بنەڕەتدا "کێ"یە. تەنانەت لە قۆناخی دواتری خوێندنیشدا نەبووە جێگەی سەرنجێکی تایبەتی، تیۆلۆژی و زانستی پزیشکی و گیانەوەرناسی و جیۆلۆجی لە ئایدنبۆرگ و کامبریجدا دەخوێند، بەڵام هەموو ئەمانە هێندەی ئەو کاتانەی دەچووە ڕاو و شکار، شادی و دڵخۆشی پێ نەدەبەخشی. دواجار لە ساڵی 1831 دا قەناعەتیان پێکرد سەفەرێک بکات و پاشان هەر ئەو سەفەرە بووە مایەی گۆڕینی هەموو ژیانی. کەشتیەکی سەر بە دەوڵەت، ناوی "بیگل" بوو، بەرەو خواروی ئەمریکا و ڕۆژهەلاتی هیندستان بە مەبەستی پشکنینی ئەو ناوچانە دەکەوتەڕێ، بۆ ئەو مەبەستەش پێویستیان بە پیاوێکی گەنجی زانستبوو کە کاری لێکۆڵینەوەی بایۆلۆجی بگرێتە ئەستۆ. داروین ڕازیبوو لەگەڵ کەشتیەکەدا بەڕێکەوێت. هەر زۆر زووتریش، وەک لەوەی مەزەنەی دەکرد، لەگەڵ بارودۆخی ژیانی ناو کەشتیەکەدا ڕاهات (ژیانی سەختی ناو پاپۆر و جوڵانی بەردەوامی، لەسەروئەوەشەوە لەگەڵ کەبتاینێکدا کە زۆر زوو توڕەدەبوو). داروین ڕۆژبەڕۆژ زیاتر بە پەرۆشەوە کارەکانی ڕادەپەڕاند وە لەپاش گەڕانەوەی "بیگل" لە مانگی دەی 1836 دا، داروین گوتی؛ تەنها ئێستاکە بەتەواوەتی لە "بەهای ژیان" تێدەگەم. پاشان کەوتە ڕێکخستنی هەموو ئەو کەرەسە بایۆلۆجیانەی لە سەفەرەکەیدا کۆیکردبوونەوە؛ دواتر ژنی هێنا و دە منداڵی هێنایە ژیانەوە، وەک سکرتێرێک و مامۆستای تایبەت و نووسەرێک کاری دەکرد. کتێبی سەفەرنامەکەی (یەکەمین کتێبی) ناوبانگێکی باشی پەیداکرد و ژمارەیەکی زۆری لێفرۆشرا. لەبارەی ئابوریشەوە داروین هیچ گرفتێکی نەبوو، چونکە سامانێکی زۆری بە میراتی بۆ مابووەوە. شاکاری نووسینەکانیشی، کتێبی "ڕەچەڵەکی ڕەگەزەکان"، لە ڕاستیدا پاش 23 ساڵ لەدوای گەڕانەوەی لە سەفەرە گەورەکەدا، بڵاوکردەوە. ئەم توێژەرەوە بەئاگایە، ماوەیەکی هێندە دوورودرێژی تەرخانکرد بۆ داڕشتن و دەرخستنی تیۆرییەکەی، بەڵام لەپاش دەرچوونی سەرنجی هەمووانی بەلای خۆیدا ڕاکێشا. چاپی یەکەمی کتێبەکەی لە یەکەمین ڕۆژی بڵاوبوونەوەیدا هەمووی فرۆشرا، دواتریش لە ناو هەموو کتێبە زانستیەکانی سەدەی بیستدا زۆرترین خوێنەری هەبوو. تیۆریەکەی گفتوگۆیەکی توندوتیژی خوڵقاند، بەڵام داروین خۆی زۆر بەکەمی بەشداری دەکرد. تاوناتاوێک کتێبێکی نوێی دەنووسی، هەندێ ڕۆمانی بەناوبانگیشی دەخوێندەوە (ئەو ڕۆمانانەی کە هەمیشە بەشێوەیەکی بەختەوەرانە کۆتاییان دێت) و تا کۆتایی ژیانی بە

شێوەیەکی نادیار ڕۆژگاری بەسەربرد. دەڵێن ڕۆژێک پێش مردنیشی گوتوویەتی؛ "تەنانەت کەمترین ترسیشم بەرامبەر مردن، لەدڵدا نیە."
داروین بە بناغەدانەری تیۆری گەشەکردنی بایۆلۆجی دادەنرێت. تیۆرییەکەشی دەڵێت؛ بوونەوەرە زیندووەکان دووچاری جۆرە پرۆسیسێکی هەڵبژاردن بوونەتەوە وە بە پلەی یەکەم ئەو بوونەوەرانە دەمێننەوە کە زیاتر لە بارن و زیاتر توانای خۆگونجاندنیان لەگەڵ ژینگەکەیاندا هەیە. بەڵگەی ڕاستێتی ئەم تیۆرییەشی لە کاتی سەفەرەکەی لەگەڵ "بیگل" دا بۆدەرکەوت. بە تایبەتیش دوورگەکانی گالاپاگۆس ("خۆی بۆ خۆی جیهانێکی تایبەتیە") کەرەسەیەکی فراوانی لێکۆڵینەوەی پێبەخشی. "ململانێی مانەوە"، شتێکە هەموو بوونەوەرە زیندووەکان خۆیانی تێدا دەبیننەوە، ئەم حاڵەتە لەپێشدا لەناو تاکەکانی ڕەگەزێکی دیاریکراودا ـ لێرەدا توانای زاوزێ و گۆڕانە بایۆلۆژیەکان گرنگی تایبەتی خۆیان هەیەـ دەستپێدەکات و تەنها ئەو ڕەگەزانە دەمێننەوە کە توانای بەربەرەکانێیان بەهێزترە. پاشان ئەو تاکانەی دەمێننەوە، لەسەر ئاستێکی بەرزتر دەبێت هەوڵی مانەوەیانبدەن، چونکە لەگەڵ ڕەگەزی ئاژەڵەکانی تر و ڕووەکەکانی تردا دیسانەوە دەکەونە حاڵەتی ململانێوە. گەر بە شێوەیەکی ساکارانە بڕوانینە مێژووی گەشەکردن، دەتوانین بڵێین ڕوونکردنەوەیەکی مێژوویی مەزنی پۆلەکان دەگرێتەوە کە بە پلەی یەکەم باس لە ڕەگەزە براوەکان دەکات. بەم پێیەش "سۆشیال داروینیزمی"ەکان دێن و دەڵێن؛ هەندێ ڕەگەز توانایان لە ڕەگەزەکانی تر باشترە و لێرەشەوە لە هەندێ ڕەگەزی تر باشترن. بەڵام داروین خۆی تەنها ئەو کاتە نائارامدەبوو کە بە شێوەیەکی شێواو هەوڵیاندەدا تیۆریەکەی لێکبدەنەوە، چونکە بابەتی کۆیلایەتیشیان بە تیۆریەکەیەوە گرێدەدا ، داروینیش لە دڵەوە ڕقی لەو جۆرە ڕاڤەکردنە بوو. مێژووی گەشەکرن بەلای داروین خۆیەوە لە جۆرە سەرژمێرییەکی مانەوە زیاتر هیچی ترنیە، وە لەڕاستیدا دەبێت زۆر زۆر بە ئاگادارییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. بێگومان هەمان ڕوانگەشی بەرامبەر تیۆری ڕەچەڵەکی مرۆڤ هەبووە، لە کاتێکدا ئەو کەسانەی دژیبوون بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بە چاوێکی پڕ لە ترس و شکستیەوە تەماشای ئەو زانیارییەیان دەکرد کە دەڵێت ڕەچەڵەکی مرۆڤ لە مەیمونەوە هاتووە. بەڵام لە ڕاستیشدا هیچ تاوانێکی تێدا نییە گەر وایدانێین ڕەچەڵەکی مرۆڤ لە بنەڕەتدا لە مەیمونەوە سەریهەڵدابێت .

(دەتوانین بەو کاتە بەراوردی بکەین کە داریون گوتی، مرۆڤ لە ئاژەڵەوە گەشەیکردووە... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 226*، 331، 431، 447، 451، 452، 475)

### Dialectics دیالێکتیک

بەشێوەیەکی گشتی، تێزی زانستی و دژی تێزی زانستی و یەکگرتنی تێزی زانستی، بە سێکوچکەی کلاسیکی دیالێکتیک دادەنرێن. ئەم سێکوچکەیەش ئەرکی پەرەپێدانی مشتومڕێکی دیاریکراو دەگرێتە ئەستۆ کە بەرەو پێشەوەی ببات، واتە لە حاڵەتێکی دیاریکراودا بوارێک بۆ بۆچوونی بەرامبەردەکاتەوە کە دەرکەوێت. بەم شێوەیە دیالێکتیک، وەک مێتۆدێک، پشت بە ویستی بیروڕا دەربڕینی ئەو کەسە دەبەستێت کە مێتۆدەکە بەکاردەهێنێت، لێرەشەو تاڕادەیک هەندێ لایەنی هەرەمەکی تێکەڵدەبێت، هەربەهۆی مشتومڕی دیالێکتیکیشەوە چەندەها بیروبۆچوون و پێشبینیکردن لە جیهاندا

سەریهەڵداوە؛ ئەم لایەنە بەتایبەتی لەسەرەتای فەلسەفەی کۆمۆنیستیدا بەدیدەکرێت، کە لە ڕێگەی دیالێکتیکەوە دەیانویست لەلایەکەوە تەفسیری جیهان و مێژووبکەن و لەلایەکی تریشەوە گەرەکیانبوو لێکدانەوەیەک بۆ چالاکیەکانی داهاتووی مرۆڤی ئاسایی بخەنەڕوو _بەڵام بەبێئەوەی ئەوانە ڕەچاوبگرن کە دەبنە قوربانی. هیگڵ، مامۆستای گەورەی دیالێکتیکی پێشوو، هەر زوو نیشانەی پرسیاری لەسەر ڕاستی و دروستی ئەو جۆرە پێشبینیانە دانا. هەر بەم بۆنەیەشەوە ناوی میتۆدی دیالێکتیکی نابوو "خشتەیەکی بێگیانی دەرەکی". لەوێدا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاماژە بۆ ڕەچەڵەکی دیالێکتیک دەکات کە لەلای سوکرات و پلاتۆنی فەیلەسوف باوبووە، ئەوان وەک ئەداتێک بەکاریاندەهێنا بۆ ئەوەی بیرۆکەی نوێ بخەنە ناو مشتومڕەکانەوە. واتە پڕۆسێسێک کە ئومێدەواربوون مەعریفەیانی پێزیادبکەن، چونکە بیروڕایەکی دیاریکراویان دەهێنایە ناو بابەتێکەوە و پاشان یەکسەر دەیانخستە ژێر گومانەوە، بەم شێوەیەش بوارێکیان بۆ قوڵبوونەوە لەو بابەتە دیاریکراوەدا دەکردەوە.

(بەڵام دیالێکتیکی هیگڵ تەنها بەسەر مێژوودا ناچەسپێت... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 390)

**Descartes، Rene` دیکارت، ڕینێ**

دیکارت "1596 تا 1650" پێشئەوەی ببێتە فەیلەسوف، ئەفسەر بوو. لەگەڵ هێزەکانی ئەمیر "مۆریتز ئۆرانیەنس"دا خزمەتی دەکرد و بەپێی ئەو سەرچاوانەی باس لە ژیانی دەکەن، لەناو هێزەکانی ئەمیردا نازناوی "شمشێربازی جەربەزە"یان پێبەخشیبوو. بەڵام هەر لەو کاتەوە شێوە بلیمەتیەکی سادەیان تێدادەبینی. بۆ نمونە لەماوەیەکی زۆر کەمدا دەیتوانی پرسیارە ماتماتیکیە سەختەکان شیبکاتەوە و ئەنجامیانبدات، وە هەموو کاتێکیش دەیتوانی باس لە تیۆرییە نوێکانی بواری فیزیا بکات. دیکارت ساڵەکانی خوێندنی قوتابخانەی لە کۆلیجێکی بە ناوبانگی شاری "لا فلیشێ" تەواوکرد. باوکی دیکارت پارێزەر و کارمەندێکی بەپلەوپایەی دەوڵەت بوو، وە لە سەر خواستی ئەم، دیکارت زانستی یاسای لە شاری پاریسدا خوێند، بەڵام ئەم خوێندنەی نەبووە ڕێگرێک لە بەردەم جێبەجێکردنی ئارەزوە تایبەتیەکانی خۆیدا. لە ساڵی 1618 دا "شاڤالیار دوو پیرۆن" (دیکارت ئەو ناوەی بە خۆی بەخشیبوو، چونکە لەپرێکدا نازناوی پیاوماقوڵی بە میراتی بۆ مایەوە) لە هۆڵەندادا دەستیکرد بە خوێندنی ئەفسەری. ئەو کاتە هۆڵەندا، لە بواری تەکنەلۆجی سەربازیدا، لەپێش هەموو وڵاتە ئەوروپیەکانەوە دادەنرا، بەدەر لەوەش بە سەربەستترین وڵاتی ئەوروپاش لە قەڵەمدەدرا. لە شەوێکی زستانی مانگی یانزەی ساڵی 1619 دا، دیکارت گرنگترین ئەزمونی فەلسەفی بەسەرداهات، ئەو شەوە لە ڕێگەی سێ خەونی یەک بەدوای یەکدا جۆرە پەیامێکی وێنەیی هاتە بەرچاوی و تیشکی خستە سەر ئەو ڕێگایەی کە لە داهاتوودا دەبوایە بیگرتایەتە بەر. دەستی لە خزمەتی سەربازی هەڵگرت و گەڕایەوە بۆ فەرەنسا، لەوێدا ژیانی خۆی بۆ زانستەکان تەرخانکرد، وە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ناوبانگی پەیداکرد و چەندین شتی سەرنجڕاکێشیان لە بارەیەوە دەگێڕایەوە. هەرچەندە نە کڵێسە و نە چاودێریکەرانی دەوڵەتیش، بنەمایەکی وایان نەبوو بە هۆی نووسینەکانیەوە، کە دەبوونە هۆی سەرهەڵدانی ناتەبایی و مشتومڕ، زیندانی بکەن، بەڵام لەگەڵئەوەشدا لە ساڵی 1628 دا دیسانەوە بڕیاریدا بەرەو هۆڵەندا کۆچبکاتەوە. لەوێدا زیاد لە 16 ساڵ مایەوە و بێشدەچێت ئاسودەترین ساڵەکانی ژیانی

بووبێت ـ چونکە دیکارت تا ئەو کاتە بە سەرزارەکی خۆشەویستی ئەزموونکردبوو، بەڵام لەوێدا پەی بە خۆشەویستی ڕاستەقینەبرد. لە دواهەمین ساڵانی ژیانیدا دیکارت پلەی پێشکەوتنی خۆی گەیاندە ئاستێکی بەرز و توانی لەسەر ئاستی وڵاتە ئەوروپیەکاندا ببێتە کەسێکی بەناوبانگ. دواتر لە ساڵی 1650 دا لەلای کریستینای شاژنی سوید کۆچی دوایی کرد. کریستینا بەتەواوەتی سەرسامی تەرزی بیرکردنەوەی دیکارت بوو، بەڵام لەهەمان کاتدا زیاد لەڕادە باوەڕی بە هێزو توانای بوو.

دیکارت (دیسانەوە) وای لە فەلسەفە کردەوە جارێکیتریش خۆی کۆبکاتەوە. بەڵێ، دیکارت چاونەترسانە خودی خۆی کردە بنچینە و کلیلی هەموو ئەندێشەکان، سەرتاپای بیرکردنەوەکانیشی بە پلەی یەکەم دەچوونەوە سەر یەک خاڵ؛ چۆن دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین ئەو زانیاریەی کە دەیزانین جێی باوەڕ و متمانەیە؟ ئەو میتۆدەی بەکاریشیدەهێنا گومانکردنێکی ڕیشەیی بوو، واتە گومانی لە سەرتاپای هەموو شتێک دەکرد کە شیاوی گومانکردن بێت. لەو سەردەمەدا خەڵکی پێیان باشبوو ڕێز لە ڕەوایەتی هەقیقەتە ڕەسمیەکان بگرن، هاوکات دیکارتیش بەئاگابوو لەوەی کە ناچارانە دەبوایە گومانەکانی لە سنوورێکی دیاریکراودا بهێڵێتەوە. لێرەشەوە کاتێکیش لێکۆڵینەوە ڕەخنەییەکانی خستەڕوو، کەم تا زۆر وازی لە دوو هەقیقەتی ڕەسمی هێنا؛ یەکەمیان خودا (بێگومان مایەی سەرسوڕمان نیە) وە دووهەمیان خود (کە زۆر پێویستی نەدەکرد وەک خاڵێکی دڵنیا بەکاربهێنرێت). ڕستە بەناوبانگەکەی دیکارت "من بیردەکەمەوە، کەواتە من هەم" هانا دەباتە بەر فێڵێک بۆ ئەوەی خود وەک بوونەوەرێکی بیرکەرەوە پێناسەبکات، لەبەرئەوەی (بەبڕوای ئەم) لە دواهەمین ئەنجامدا گومانکردن دەبێت خۆی بەدەستەوەبدات _ چونکە بەهیچ جۆرێک ناکرێت گومانمان لە شتێک هەبێت کە بوونی نەبێت. لەم خاڵەشەوە، کە پڕە لەدڵنیایی، دەکرێت هەموو پێناسەکانی هەقیقەت هەڵبهێنجرێت. خود، وەک بوونەوەرێکی بیرکەرەوە، لە سەرو هەموو مادە و بابەتێکەوە دەوەستێت؛ بۆ نمونە سروشت، کۆمەڵگا، هەروەها لەشیش، کە دیکارت بەڕاشکاوی وەک شتێک لە قەڵەمیدەدا کە لە بیرکردنەوە جودابێت. بێگومان ڕۆح و لەش لە کاتی ژیانی سەر زەویدا پەیوەستی یەکترین، هەرچەندە لە بنەڕەتەوە جیاوازن. ئەم جیاوازییەش ئەو لایەنی کار و ئەرکە تایبەتیانەی ڕۆح و لەشیش دەگرێتەوە، کە لە کاتی مردنی مرۆڤێکدا ئاشکرادەبێت؛ ڕۆحی مرۆڤ لەش بەجێدەهێڵێت و بەرەولای خودا سەردەکەوێت، بەڵام پاشماوە زەمینیەکان هێواش هێواش دەفەوتێن و بەڵگەی کورتخایەنی لەش دەسەلمێنن. دیکارت ئاماژەی بۆ ئەندامێکی دیاریکراودەکرد و دەیگوت ڕۆژانە لە ڕێگەیەوە لەش و ڕۆح هاریکاری یەکتردەکەن؛ (ئیپیفوس ـ گلاندی نخاعی) کە لە ڕێگەی مێشکۆلەوە کاری بەڕێوەبردن هەڵدەسوڕێنێت.

دەتوانین دیکارتی فەیلەسوف بە باپیرەگەورەی زانستی مۆدێرن دابنێین. ئەو دیدە دوولایەنیەی دیکارت گەشەی پێدا، جۆرە فریودانێکی لەخۆگرتبوو، وە بەردەوامیش تێیدایە، و تا ئێستاکەش چەندین زانستی مۆدێرن بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت؛ لە کاتێکدا کە خود و مەتریالی چواردەورەکەی بە تەواوەتی لەیەک جودابن، کەواتە ڕێیتێدەچێت کاری مەعریفی ڕاستەقینە بەدیبهێنین. واتە خود، کە بوونەوەرێکی بیرکەرەوە و تۆێژەرەوەیە و هەمیشە دەخوازێت شت بزانێت، دەتوانێت مەعریفەیەک هەڵچنێت کە سەرچاوەکەی لە شتی مادی دیاریکراوەوە هاتبێت و بەوجۆرەش بیکاتە هەقیقەتێکی سوودبەخش و متمانە پێکراو. فەلسەفەی دیکارت، بەبێئەوەی بەتەواوەتی

مەبەستیبوبێت، پەردەی لەسەر شتە پڕنهێنیەکانی جیهان هەڵماڵی و لەو کاتەشەوە جیهان بە تەواوەتی بۆتە بابەتێکی بەردەست (بۆ هەموو کەسێک، نەک تەنها بۆ ئەو کەسانەی کە بەتایبەتی بەدوای زانیندا دەگەڕێن). ئەو نهێنیانەی، کە بوونەتە نهێنی، ئاماژە بۆ شتێکدەکەن کە هێشتام هەر نادیارن و شایانی دۆزینەوەن، جێگەی سەرسوڕمانیشە (کە تائێستاکەش) دەگەڕێنەوە سەر ئەو دوو هەقیقەتەی کە دیکارت نەیدەویست گومانیان لێبکات؛ خودا و ئاگایی مرۆڤ. بیرمەندەکان (تائێستاکەش) بەتەواوەتی نەیانتوانیوە ئەم دوو بابەتە ڕوونبکەنەوە.

(دیکارت... دەیوست تەواوی هەموو کەرەسە کۆنەکانی شوێنی کارەکە لابەرێت... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە، 241، 248، *249، 263، 266، 270، 277، 281، 287، 301، 328، 334، 337، 345، 352، 358، 386، 390، 406)

### Democritus دیمۆکریتس

دیمۆکریتس (نزیکەی 460 تا نزیکەی ساڵی 370ی پێش مەسیح ژیاوە)، بەپێی باوەڕی خۆی، پیاوێکی خاوەن ئەزموون بووە و شارەزاییەکی فراوانی سەبارەت بە ژیان هەبووە. هەروەک خۆی دەیگوت سەفەری زۆر چەندەها شتی جۆراوجۆری فێرکردووم. دەگێڕنەوە دەڵێن پیاوێکی دڵخۆش و بەزەوقبووە و بە پێچەوانەی "هیراکلیت"ی هاوەڵیەوە بووە کە هەمیشە دڵتەنگ و تووند مەزاجبووە. لە مێژووی فەلسەفەدا دیمۆکریتس بە دووهەمین فەیلەسوف دادەنرێت کە تیۆری ئەتۆمی دارشتبێت (یەکەمین کەس "لیۆکیپۆس"ی مامۆستای بووە)؛ ئەتۆمەکان بەردی بناغەی هەموو گەردوونن، وە بەسەر بەشی بچکۆلەتردا دابەش ناکرێن، بەڵام قەبارە و شێوە و کێشی جیاواز جیاوازیان هەیە. ئەتۆمەکان لەناو بۆشایدا دەجوڵێنەوە و کاتێکیش بە شێوەیەکی دیاریکراو کۆمەڵ کۆمەڵ بەریەکتر دەکەون، شتە جیاوازەکانی جیهان دێننە بوون. مرۆڤیش لە ئەتۆم پێکهاتووە، وە دڵخۆشی مرۆڤ پشت بە هاوسەنگی و ئارامگرتنی ئەتۆمەکانی ڕۆحی دەبەستێت، لێرەشەوە شتێکە کە لە دەستی مرۆڤدایە، چونکە لایەنی ڕۆحی مرۆڤێک بەرپرسیارێتی تایبەتی ئەو مرۆڤەوە دەنەخشێنێت... دەتوانین بڵێین تاڕادەیەکیش سەربەستی، دەنا لە ڕاستیدا مرۆڤ لەناو یاسا فراوانەکانی سروشتدا شوێنێکی یەکجار چکۆلەی هەیە .

(ئەمڕۆ باسی دواهەمین فەیلەسوفی گەورەی سروشتی دەکەین. ناوی دیمۆکریتس بوو... جیهانی سۆفیا، لا. 50، *53، 55، 56، 72، 93، 122، 143، 177، 239، 246، 291، 312، 352، 383، 418)

### Diogenes دیۆجێنیس

دیۆجێنیس "نزیکەی 400 تا 325 ی پێش مەسیح"ی لەدایکبووی شاری "سینۆپا"، یەکێک بوو لەو فەیلەسوفە یەکەمینیانەی کە خەڵکی پێی پێدەکەنین. ئەم بیرمەندە بە چەند جۆرێکی جیاواز لە مێژووی فەلسەفەدا وەسفدەکرێت. فەیلەسوفەکان وەک کەسێکی دوور لە ژیان و تەنها و جۆرە باڵندەیەکی کۆمیدی لە قەڵەمیان دەدا و دەیانگوت چاوەڕوانی

ئەقڵ و حیکمەتێکی زۆری لێناکرێت. بەڵام ڕەنگە دیۆجێنیس مرۆڤێکی زیرەکبووبێت. ئێمە بە هیچ جۆرێک بە دڵنیاییەوە نازانین گەر بەڕاستی لە بەرمیلێکدا ژیابێت و کەسێکی ڕەق و بێداخوازیبووبێت یان نا، بەڵام بەدڵنیاییەوە دەزانین کە قوتابخانەیەکی فەلسەفی تەواو "سینیکەکان" بەناوی ئەوەوە ناو نراوە، لەقەبی ئەم "سینیک" بوو، واتە "سەگ". ئانتیستێنیس، کە مامۆستای ئەم بوو، ئەویش سەر بە هەمان قوتابخانەیە. یەکێک لە بەسەرهاتە خۆشەکانی دیۆجێنیس لەو کاتەدا ڕوودەدات کە ئەلێکساندەری گەورە دەچێتە میوانی، ئەلێکساندەر خۆی بە گەورەتر دەزانێت بەڵام بە ئەدەبەوە لێی دەپرسێت؛ هیچ شتێک دەخوازیت بۆت جێبەجێبکەم؟ ئەویش بە شێوەیەکی ڕەق و توندوتیژ وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت "بەڵێ، دەخوازم هەنگاوێک بڕۆیتە ئەولاوە، چونکە بەری خۆرەکەت لێگرتووم ."

(بەناوبانگترین فەیلەسوفی سینیک، دیۆجێنیس بوو... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 141)

### Russell، Bertrand ڕاسل، برتراند

ڕاسل "1872 تا 1970" بەدرێژایی ژیانی (لە ساڵی 1950 دا خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت) وەک کەسێکی بەڕێز تەماشادەکرا و لە هەمان کاتیشدا مایەی مشتومڕێکی زۆر بوو. زانای ماتماتیک و فەیلەسووف و نووسەریش بوو، وە خۆی وەک ئاشتیخوازێکی تووندڕە و ڕەخنەگرێکی کۆمەڵگا نیشاندەدا. ڕاسل، وەک دیموکراتێکی ڕادیکال، برادەری کەم بوو؛ وەک فەیلەسوفیش پەسەند نەدەکرا، چونکە ئیمپیریزمی لۆک و هیومی هاووڵاتی نۆێکردەوە. ڕاسل فەلسەفەکەی خۆی وەک ڕێبازی "ئەتۆمیزمی لۆژیکی" دەناساند. بەبڕوای ئەو هەقیقەت شیاوی دابەشبوونە و بچوکترین توخمەکانیشی شیاوی ناولێنانە، بێگومان ئەم کارە پێویستی بە "زمانێکی نمونەیی"یە کە بتوانێت شێوەیەکی تایبەتی ئەبستراکت گەشە پێبکات. ڕاسل هۆی بەرز هەڵسەنگاندنی خۆی (هەڵبەتە شانبەشانی ئاشتیخوازییە مەزنەکەی، ناو بەناوێکیش چالاکی گەورەی هەبوو) دەگەڕانەوە بۆ هەبوونی "سێ شێوەی سۆزی بەتین"، کە خۆی دەیگوت هەمیشە لەگەڵیدابوون؛ "خواستنی خۆشەویستی و حەزکردن بە زانین و هەستکردن بە ئازارەکانی مرۆڤایەتی."

(برتراند ڕاسل کە ئیمپیریستێکی ئەم سەدەیەی خۆمانە، نمونەیەکی گەورەتر دەهێنێتەوە... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 295)

### Rationalism ڕاشیونالیزم

ڕاشیونالیزم جەختی لەسەر گرنگی ئەو ڕۆڵە دەکات کە هزر (ڕاشیو؛ ووشەیەکی لاتینییە و ڕێک مانای هزر دەبەخشێت) دەیبینێت و متمانەیەکی پڕاوپڕی پێیە، وە لەمەش گرنگتر، چاوەڕوانی چەند ئومێدێکی گەورە گەورەی لێدەکات. ڕاشیونالیزم بە تایبەتی لە سەدەی ڕۆشنگەریدا باوبوو، وە زیاتر بەپێی زانستێکی ماتماتیکی وورد دەڕۆیشت. لە فەلسەفەی دیکارت و سپینۆزا و لایبنیزدا وێنەی ئەم فەلسەفەیە دەبینین. بیرکردنەوەی ڕاشیونالیزمی نمونەیی بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش لایەنی بێسنووری پێوە دیاربوو؛ "تەنها ئەوەندەی ئەگەر بە پێی پێویست زیرەک بین و توێژینەوەی دوورودرێژتر بکەین،

ئەوا دەتوانین پەی بە هەموو شتێک بەرین". ئەمرۆکە هەرچەندە لە هەموو بارێکەوە لە هەموو سەردەمەکانی تر زیاتر دەزانین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕاشیۆنالیست نابینین .

(ناواخنی فەلسەفەی وڵاتی پلاتۆن، هەروەک سەرجەمی هەموو کارە فەلسەفیەکانی تری، لە ژێر ناونیشانی ڕاشیونالیزمدا دادەنرێت. جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 101)

**Politics ڕامیاری "پۆلیتیک "**

زاراوەی "پۆلیتیک" لە ووشەی "تا پۆلیتیکا"ی یۆنانییەوە هاتووە کە مانای "کێشە و کاروباری وڵات" دەبەخشێت، وە لە بنەڕەتدا مەرجێک بوو بۆ هەموو زانستی ژیان بەسەربردن لە ناو وڵات و هاوبەشیدا. ئەو ژیانەش لە پێش هەموو شتێکی دییەوە دادەنرا و دەشبوایە "ژیانێکی باش" بوایە؛ ژیانێک کە لە ناواخنیدا لە چالاکی و خۆنیشاندانی تاکەکەس زیاتری تێدابێت. ئەمرۆکە وادەردەکەوێت کە ڕامیاری لە ڕادەبەدەر خۆی لە هەموو هەڵسەنگاندنە ئاکارییەکان و باوەکان سەربەستکردبێت، هەرچەندە ئێستاکەش لە ناو وتارە ڕامیارییەکاندا بەردەوام بە پلەی یەکەم ڕێک ئەو بابەتانە تاوتوێ دەکرێن و باسدەکرێن. هەروەک دەڵێن ڕامیاری "تەنها بازرگانی"یە و هیچی تر، بەڵام ئەگەر ئەمە ڕاست بێت، ئەوا بە تەواوەتی ناتوانین ئەو شتانە ببینین کە لەم بازرگانییەدا دەفرۆشرێن. سیاسەتمەندان، واتە ئەو کەسانەی سیاسەت دەکەن، سەرقاڵی ئەوەن قەناعەتمان پێبکەن کە بەردەوام لە ژێر باری گلەییدان و ژیانێکی سەخت بەسەردەبەن .

(...سێهەمین فۆرمی وڵاتی باشیش، ئەریستۆتالیس ناوی دەنێ "پۆلیتی"... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 126)

**Rawls، John ڕاولس، جۆن**

جۆن ڕاولس "لەدایکبووی ساڵی 1921"ی فەیلەسوفی ئەمریکی لە لایەن فەلسەفەی کرداری کانتەوە کاریگەری لەسەرە. ڕاولس بەم شێوەیە بیرۆکەی "هەقانییەت" هەڵدەسەنگێنێت؛ لە پێشدا لە پێداویستی تایبەتی تاکەکەس دوری دەخاتەوە، وە هەقانییەتی تاکەکەس ئەو کاتە (دیسانەوە) بە شتێکی گرنگ دەبینێت کە کۆمەڵگا لە بنەڕەتەوە لەسەر بنەمایەکی خۆنەویستی دامەزرابێت. لێرەشەوە هەندێ ماف دەردەکەون کە لە هەموو داواکارییەکی کۆمەڵگا تێدەپەڕێت؛ "هەموو مرۆڤێک مافی هەست بریندارنەکردنی (حورمەت نەشکاندنی) هەیە کە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دادوەری و هیچ ویست و مافێکی کۆمەڵگا بۆی نییە لێی زەوتبکات. کەواتە مرۆڤ لە کۆمەڵگایەکی دادپەروەردا، بەهۆی مافی دادوەرییەوە، نابێت ببێتە بابەتێک کە مامەڵەی ڕامیاریان پێوەبکرێت، یان ببێتە بابەتێکی هەڵسەنگاندنە کۆمەڵایەتییەکان."

(جۆن ڕاولس یەکێکە لە فەیلەسوفە ئەخلاقیەکان و کاریگەری مارکسیشی لەسەر بوو... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 429)

### Rousseau، Jean-Jacques ڕووسو، جان جاکیوس

ڕووسو "1712 تا 1778" مۆسیقاربوو، بەڵام دواتر هاتە ناو جیهانی فەلسەفەوە. ئەم لە خێزانێکی هەژاردا لەدایکبوو و وەک پیشەش وێنەی لە سەر پلێتی مس چاپدەکرد. هەر لە تەمەنی گەنجیدا خێرخوازێکی ئافرەتی بووبەتووشەوە، پاشان بووە خۆشەویستیشی، وە بەهۆی هاریکارییەکانی ئەوەوە توانی لە ڕێگەی خوێندنی تایبەتییەوە قوتابخانەی باڵا تەواوبکات. دواتر بووە زانایەکی بەناوبانگ، هەڵبەتە ئەمیش وەک هەموو ئەوانەی لە پرێکدا ناوبانگ دەردەکەن زۆری پێناخۆشبوو ڕەخنەی لێبگیرێت. پێشکەوتنی لە بواری فەلسەفەدا ئەو کاتە ڕوویدا کە "ئەکادیمی دیژیۆن" پێشبڕکێیەکی فیکری بەم ناونیشانە سازدا؛ "تا چ ڕادەیەک زانست و هونەری نوێ کۆمەکی پەرەسەندنی دابونەریتی کردووە؟"، ئەمیش بەشداریکرد؛ هەرچەندە لە ڕاستیدا تێزەکەی ئەم بە پێچەوانەی تێڕوانینە گەشبینەکانی سەردەمەکەیەوە بوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەڵاتی یەکەمی بەدەست هێنا. ڕووسو دەیگوت مرۆڤ لە بنچینەی "حاڵەتی سروشتی" باشەی خۆی دورکەوتۆتەوە و بۆتە "خۆپەرست"؛ مرۆڤ سەلامەتی و "سامانی تایبەتی" خۆی لە سەرو ئاسوودەیی کۆمەڵگاوە دادەنێت و ئەمەش وەک جۆرە سەربەستییەکی تاکەکەس دەبینێت. ڕووسو لەگەڵ بردنەوەی خەڵاتی ئەکادیمی دیژیۆندا لەماوەی شەوو ڕۆژێکدا ناوبانگی دەرکرد. لەو کاتەوە گەورەترین سەردەمی بەرهەم بەخشینی دەستپێکرد، چەندین کتێبی نووسی و وەک کەسایەتییەکی دیار بووە مایەی سەرنجی جەماوەر. ڕووسوی فەیلەسوفی کۆمەڵگا بەردەوام لەسەر بیروڕا نەگەتیفیەکەی نەمایەوە؛ لە کاتێکدا گەیشتن بەو "حاڵەتە سروشتییە" سەختە، کەواتە دەبێت خەڵکی جۆرە ژیانێکی هاوبەشی بهێننەدی، واتە لە ڕێگەی پەسەندکردنی جۆرە "پەیمان نامەیەکی کۆمەڵایەتی" یەوە مرۆڤ دەتوانێت بگاتە ویستێکی هاوبەش کە ئاسوودەیی کۆمەڵگاکەی بهێنێتە دی. ڕووسو تەنها لە بواری فەلسەفەدا شایانی مشتومڕ نەبوو، بەڵکو وەک مامۆستایەکی پەروەردەش هەر هەمان شت بوو؛ لە ڕۆمانی "ئیمیل"دا سەبارەت بە پەروەردەکردنی منداڵ جەخت لەسەر لایەنی خۆشەویستی و خزمەتکردنی منداڵ دەکات، ڕاستە ڕۆمانەکەی ژمارەیەکی زۆری لێفرۆشرا، بەڵام بە بەراوردکردنی لەگەڵ خۆیدا وەک باوکێک تەواو نەگونجاوبوو؛ ڕووسو هەر پێنج منداڵەکەی خۆی هەر لە دوای لەدایکبوونیانەوە ڕەوانەی خانەی منداڵانکرد. ڕووسو لە دواهەمین ساڵی ژیانیدا تووشی پارانۆیابوو (پارانۆیا؛ نەخۆشیەکە کە کەسەکە هەستدەکات خەڵکانێک بەمەبەستی ئازاردانی بەدویەوەن و لە پاشملە قسەی بۆ هەڵدەبەستن و هتد. و). بە بڕوای ئەو برادەرەکانی خیانەتیان لێدەکرد، وە پێیوابوو ئەو کەسانەی پشتگیریاندەکرد، دەیانفرۆشت؛ ئەو دەیگوت دوژمنەکان لە هەموو شوێنێکدا گوێیان هەڵخستووە. دواتریش "بیرمەندە هەرە بەناوبانگەکەی ئەوروپا"، هەروەک ناوەندی ڕاگەیاندنەکانی ئەو کاتە ناویان نابوو، وەک پیاوێکی تووڕە و دڵڕەنجاو مرد. ڕووسو لە یەکێک لە دەستنووسە دواییەکانیدا ئەم چەندووشەیەی نووسیبوو؛ "جگە لە هەست برینداکردن و درۆ و خیانەت، چاوەڕوانی هیچ شتێکی تر نیم لە خەڵکی. یەزدانی نەمر، من پشت بە تۆ دەبەستم"□

(...لەوانەیە لە یادت بێت کە ڕووسو زاراوەی "گەڕانەوە بۆ سروشتی" هێنایە کایەوە... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 284، 334، 368، 372*)

## Romance ڕۆمانسی

سەدەی ڕۆشنگەری ڕۆشنایی زۆری لەگەڵ خۆیدا هێنا، بەڵام لە ئاستێکدا خەڵکی هەستیان دەکرد بەپێی پێویست ڕۆشنبوونەتەوە، لێرەوە سەرەتای سەرهەڵدانی سەدەی ڕۆمانسی دەستیپێکرد. لەڕاستیدا هزری ڕۆمانسی لەچەند بەرنامەسازییەکی ئەقڵانی زیاتر هیچیتر نەبوو؛ بۆ نمونە، نهێنییەکانی خود، شتە بەهادارەکانی جیهان؛ بۆ وێنە لایەنی پەنهان و تاریکی ژیان، هەروەها باسی ئارەزووەکانی دڵ و وێنە دڵگیرەکانی سروشتیش دەکات کە لە سەردانێکی بەزۆرەملێی کڵێسە زۆر زیاترمان دەربارەی خودا و ئاسمان پێدەڵێت. جگە لەمانەش ئەدەبی ڕۆمانسی، کە پێش فەلسەفەی ڕۆمانسی کەوت، کۆمەڵێ بابەتی تریشی هێنایەکایەوە؛ باسی ژیانێکی هەمەڕەنگی دەکرد، بەتایبەتیش ژیانی خەڵکی ئاسایی، کە هەتاوەکو ئەوکاتە وەک سەرچاوەیەکی سروشبەخش نەدەبینران و تەنها بنێشتە خۆشەی سەر دەمی ڕووناکبیرەکان بوون. فەلسەفەی ڕۆمانسیش لەلای خۆیەوە دەیویست ئەو ژیانە نوێیە ڕێکبخات، وە لێرەشەوە خودی دەسەڵاتداری ئەو سەردەمەی لە ژێر ڕژێمێکدا کۆدەکردەوە، ئەمەش شتێکبوو کە نە خود پەسەندی دەکرد و نە ژیانە پڕ لە زیندوویەتیەکەشی. نۆفالیسی نووسەر بەم شێوەیەی خوارەوە وەسفی چۆنیەتی بەڕۆمانسی کردنی بابەتەکانی دەکرد؛ "کاتێک کە من مانایەکی بەرز بە شتە ساکار و بێ ناوەڕۆکەکان دەبەخشم، کە سیمایەکی پڕنهێنی دەدەمە شتە باوەکان، کە بەهایەکی نەناسراو بە شتە ناسراوەکانەوە گرێدەدەمەوە، کە مۆرکێکی بێکۆتایی دەدەمە شتە کەمخایەنەکان، ئەو کاتانە دەتوانم بڵێم شتەکان دەکەمە ڕۆمانسی..." لە کاتێکدا ئارنیمی نووسەری هاوەڵی بە شێوەیەکی ناسک وەسفی هەستی ڕۆمانسی دەکات و دەڵێت؛ "ئەگەر تەنها کەڕەتێک لەناو هەڵپەرکێیەکدا خۆتت لە یادکردبێت، ئەگەر تەنها کەڕەتێک دیمەنی باڵۆنێکت بینیبێت هێواش هێواش وەک خۆر بە ئاسماندا بەرزدەبێتەوە و وەک دواهەمین سڵاوی مرۆڤ خۆی دەنوێنێت... ئەو کەسەی کە جارێک لەکاتی خۆرئاوابووندا کەشتییەکی شەڕی بینیبێ کە لەنگەر دەگرێ، لە چەند ساتێکی پڕ لە ژیان و جوڵەدا ئەو قەڵا ئاڵتونی و تابلۆ قەشەنگ و چارۆکەی بەلەمانەی بینیبێت کە بە هێمنی لە چوارچێوەی ئاسمانی دەریادا نقومدەبن، گەر هەموو شتەکانی چواردەورمان ببینین، کەواتە دەبێت بڕوا بە بوونی شێوەیەکی بەرزتری ژیان بکەین، دەبێت بڕوا بە هونەرێکی باڵاتر بکەین، چونکە لە چواردەورماندایە و هەموو یەکێکمان لە ڕۆژی یەکشەممماندا، لە پاش شەش ڕۆژی کار، ڕووبەڕووی دەبینەوە و هەستی پێدەکەین."□

(ڕۆمانسی... ڕێگا پڕ نهێنییەکە بەرەو ناوەوە دەڕوات... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 364)

## Renaissance ڕێنیسانس

ڕێنیسانس جۆرە هەستانەوەیەکی گەورە دەگرێتەوە و ووشەکەش مانای "لەدایکبوونەوە" دەبەخشێت؛ بیرکردنەوەی سەدەکانی کۆن ژیانێکی نوێی پێدەبەخشرێتەوە، وەک ئاکامێکی ئەم حاڵەتەش، مرۆڤ سەرلەنوێ وەک بوونەوەرێکی سەربەخۆ تەماشادەکرێتەوە و چیتر وەک بوونەوەرێک دەرناکەوێت کە خۆی لە ژێر ڕەشماڵی ئەو گوناحەدا بشارێتەوە کە تا ئەو کاتەش بەسەریدا ڕاکێشرابوو. سەدەی پانزە بە سەردەمی

هەرە بەناوبانگی ڕێنیسانس لەقەڵەم دەدرێت، ئەو کاتە بوو کە شاکارە هونەرییە گەورەکان سەریانهەڵدا، وە دیارترین وڵاتیش کە ڕێنیسانسی پێوە دیاربوو ئیتاڵیا و فەڕەنسابوو. ڕێنیسانس لە کۆتاییەکانی سەدەی شازدەدا دیسانەوە هێدی هێدی دیارنەمایەوە. لایەنی ژیانەوەی ڕێنیسانسیش، بەتایبەتی بەهۆی هۆکاری دەرەکی ناڵەبارەوە، جارێکی تر وەک هەڵم وون بووەوە، مرۆڤیش سەرلەنوێ کەوتەوە ژێر نیگەرانییە باوەکەی خۆی .

(ڕێنیسانس... ئەی ڕەگەزی خودایی لە پێستی مرۆڤدا... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 183، 187، 201*، 211)

**Zenon زینۆن**

زینۆن "نزیکەی 336 تا 264 ی پێش مەسیح" خەڵکی قوبروس بوو و لە ڕاستیدا بازرگان بووە. ئەم تاڕادەیەک بە ڕێکەوت بوو بە فەیلەسوف؛ لە سەفەرێکیدا کەشتیەکی دەشکێ و لە شاری ئەسینادا لەماڵی کتێب فرۆشێک جێنشین دەبێت، ڕێک لەو کاتەدا کتێب فرۆشەکە سەرقاڵی تاوتوێکردنی کتێبێکی فەلسەفی دەبێت. زینۆنیش تەماشای کتێبەکەی دەکات و دەستدەکات بە خوێندنەوەی، کەمێک دواتر زۆر بەڕوونی هەستدەکات کە لەوەبەدواوە خۆشی دەیەوێت بەدوای هەقیقەتدا بگەڕێت. پاشتر دەبێتە دامەزرێنەری بنچینەی فەلسەفەی ستۆیکەکان، وە وەک کەسایەتیەکی تایبەت ناو دەبرێت؛ جگە لەمانە مرۆڤێکی باریکەلەی باڵابرز بووە و هەمیشەش جل و بەرگێکی کەمێک هەژارانەی پۆشیوە، لە کاتی بیرکردنەوەی قووڵیشدا سەری لارکردۆتەوە. هەرچەندە بەرامبەرەکانی زینۆن ئەم خاسیەتە دەرەکیانەیان بە شتێکی سەیروسەمەرە لە قەڵەم دەدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەک کەسێکی زیرەک ناوبانگی دەرکرد و ژمارەی شاگردەکانی بەردەوام لە زیادبووندا بوون. زینۆن لایەنی هزری بەرزدەنرخاند؛ "بوونی ڕاستەقینەی مرۆیی لە هزردایە"، وە هەر لەوێشدا بەپێی پێویستی ناوەوەمان هەموو شتێک ڕوودەدات و پێکدێت. ئەقڵ سەربەستیەکی تایبەت بە خۆی هەیە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا شتە پێویستیەکان سنووری بۆ دادەنێت؛ "تەنها ئەو کەسە سەربەستە کە لە ناوەوەیدا سەربەستە و تەنها ئەو شتانە دەکات کە ئەقڵی پێی دەڵێت". ئەقڵە کە بە مرۆڤ دەڵێت "چ شتێک بکات و .. چ شتێکیش وازلێبهێنێت". زینۆن ناوی ئەو دەنگە هزریەی نابوو "پاکێتی"، وە دەیگوت بنچینەی ئاکاری ناوەوەی مرۆڤ پێکدێنێت؛ "دەبێت گەران و دۆزینەوەی (پاکێتی) تەنها بە مەبەستی گەیشتن بە پاکێتی بێت و هیچیتر، وە دەبێت چاوەڕوانی هیچ پاداشتێکیش نەبین". زینۆن خۆی ژیانێکی دوورە پەرێزی هەڵبژاردبوو، بەڵام لە فەلسەفەکەیدا باسی پێکەوەژیان و هاوبەشی دەکات؛ ئەو دەیگوت ئەرکی سەرشانی هەموو کەسێکە کە بەشداری خۆی بۆ بەدیهێنانی کۆمەڵگایەکی ئاسوودە پێشکەشبکات؛ "ئێمە بە شێوەیەکی سروشتی وا خوڵقێنراوین کە پێکەوەبین، کە یەکبگرین، کە وڵات بنیات بنێین.. مرۆڤی باش و پاک لە تەنهایدا ناژی، بەڵکو بۆ ژیانێکی چالاک دروستبووە."

(دامەزرێنەری ئەم ڕێبازەش "زینۆن" بوو، کە لە ڕەچەڵەکدا خەڵکی قوبروس بوو... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 141)

### زەینۆفانیز Xenophanes

لە یەکێک لە فەرهەنگە گشتیە بەناوبانگەکانی سەدەکانی کۆندا نووسراوە (زەینۆفانیز "نزیکەی 570 تا 475 ی پێش مەسیح" لە بنەڕەتدا فەیلەسوف نەبووە). ئەمەش شتێکە کە دەبێت دژی بوەستین، چونکە هەموو ئەو زانیاریانەی سەبارەت بە زەینۆفانیز لەبەردەستدان، وای نیشاندەدەن ئەو بیرمەندێک بووە کە بیرکردنەوەکانی پێش سەردەمەکەی خۆی کەوتوون و تارادەیەکیش جێگەی سەرسوڕمانە کە بیروڕاکانی لە بۆچوونە مۆدێرنەکان دەچێت. ئەو ڕەخنەی لەو وێنە خوداییانە دەگرت کە مرۆڤ بۆ خۆیانیان دروستدەکرد و دەیگوت "زۆر لە مرۆیی دەچن و لەبەرئەمەش شایانی ئەوەن پێیان پێبکەنین، وە هەروەها پێیوابوو وێنە خوداییەکان وەک مرۆڤەکان جیاوازبن. بەڵام خودا "لەو شێوە وێنانە و لە مرۆڤەکانیش مەزنترە" وە "بەهیچ شێوەیەک لەو شتانە ناچێت کە شیاوی مردنن، چ وەک جەستە و چ وەک ڕۆحیش". مرۆڤ دەتوانێت زانیاریەکی سەبارەت بە بوونی خودا هەبێت، بەڵام ناتوانێت بە شێوەیەکی ڕاست و دروست پەی پێبەرێت. بەشێوەیەکی گشتیش هیچ بوارێکی نیە کە هانای بۆ بەرێت و لەو ڕێگەیەوە بیناسێت. مرۆڤ دەبێت ئەزموونە ئاساییەکان و هەقیقەتە کاتیەکان و ئەگەرەکان پەسەندبکات. لەم بارەیەوە زەینۆفانیز ڕستەیەک دادەڕێژێت کە زۆر بەئاسانی دەکرێت وەک تیۆریەکی مەعریفەی ئەمڕۆکە دابنرێت؛ "دەشێت بەم شێوەیە بڕوا بە شتەکان بکەین؛ وەک ئەوەی شتێک بن کە لە هەقیقەت دەچن!..." ئەمەش تەبایە لەگەڵ ئەو مەزەنەیەدا کە دەڵێت بیرو بۆچوونەکان یەک جارەکی نین و بۆ هەتاهەتایە نامێننەوە، بەڵکو لە گەشەیەکی بەردەوامدان _ واتە پەیوەستی ئەو پێشکەوتنی مەعریفەیەن کە لەڕێگەی تێپەڕبوونی کاتەوە سەرهەڵدەدات؛ "خواکان لە سەرەتاوە هەموو شتێکیان بۆ مرۆڤ ئاشکرا نەکردووە، بەڵام مرۆڤ لەڕێگەی گەڕانی بەردەوامیدا وە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا دەگەنە زانینێکی ئاشکرای مەزنتر". زەینۆفانیز زۆربەی ژیانی لە بەشی یۆنانی خواروی ئیتاڵیادا بردەسەر، ژیانێک کە پڕبوو لە گەڕان بەم لەولادا، وەک ئاکامێکی ئەمەش ئاساییە کە لە تەمەنێکی گەورەدا کۆچی دواییکرد. دەڵێن یەکێک لە شێوەکانی نان پەیداکردنی ئەوە بووە کە لە ناو ماڵە دەوڵەمەندەکاندا وانەی گوتۆتەوە. ئەو تەواو لەو بڕوایەدا بوو کە مرۆڤ نابێت وا هەستبکات کە بڕوا و ووتەکانی ڕاست و دروستن، ئەو بیرۆکەیەشی لەم هۆنراوە جوانەدا دەربڕییوە؛ "هیچ کەسێک هەقیقەتی پڕاوپڕ و دڵنیای لا نییە، وە هیچ کەسێکیش ناتوانێت بەو هەقیقەتە بگات/ من باس لە خواکان و هەموو شتەکانی تریش دەکەم/ هەرچەندە ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان کەسێک دەرکەوێت و گوزارش لە هەقیقەتێکی پڕاوپڕبکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەشێ زۆر دڵنیا نەبێت؛ چونکە هەموو شتێک لە گریمانەکردن پێکهاتووە".

(دەتوانین لەلای زەینۆفانیزی فەیلەسوف، نمونەی یەکەمین ڕەخنە ببینین کە لە ئەفسانە گیرا... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 37...)

### سارتەر، جان پۆل Sartre، Jwan-Paul

سارتەر "1905 تا 1980" مامۆستا و نووسەر و فەیلەسووف بوو. بە هاریکای "سیمۆنە دی بیوڤوار"ی هاوسەری ژیانی گەشەی بە جۆرە فەلسەفەیەکی سەربەستیدا کە یاساکانی لەسەر بنەمای بوونی تاکەکەس هەڵدەچنی. لە بنەڕەتدا مرۆڤ سەربەستە؛ سەربەستی

مرۆڤ بریتییە لە توانای "ڕچەشکێنی ـ تجاوز"ی. مرۆڤ دەسەڵاتی بەسەر خۆی و بارودۆخەکەیدا دەشکێت و دەتوانێت خۆی لە سەرویانەوە بدۆزێتەوە، دەتوانێت بارودۆخ بگۆڕێت و لە هەمانکاتیشدا ـ بەپێی پێویستی خۆی ـ سەر لەنوێ دیاریبکاتەوە. بەدەر لەمەش مرۆڤ تەنها وەک کەسێکی تەنیا خۆی نانوێنێت، بەڵکو وەک بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتیش خۆی دەدۆزێتەوە. مرۆڤ لە سەربەستییەکەیدا تەنیا نییە؛ بەڵکو تووشی "نیگای بەرامبەرەکەشی" دەبێت. هەرچەندە لە سەرەتادا وادەردەکەوێت لە سەربەستییەکەی کەمبکاتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا دوو ئەوەندە زیادی دەکات؛ نیگای بەرامبەر، لە چەند ساتێکی کەمدا لە شتێکی خۆییەوە دەبێتە شتێکی بابەتی و ڕەوانەدەکرێتەوە بۆ بەرامبەرەکەی، لێرەشەوە حاڵەتێکی دیالێکتیکی سەرهەڵدەدات کە هەردوولا پێی دەزانن. سارتەر تاڕادەیەک یاریدەی پەسەندکردنی فەلسەفەی بوونگەری "وجودی" دا. ئەو خۆی هیچ جۆرە گرنگییەکی بە لایەنی باوی شتەکان نەدەبەخشی و بەشێوەیەکی مەبدەئیش لە دیدەیەکی کراوەوە تەماشای بوونی مرۆڤی دەکرد (لەو ڕوانگەیەوە کە لە سەربەستیدا دەژی)؛ توانای هەڵبژاردنی مرۆڤ دیاردەیەک نییە کە تەنها جارێک ڕوودەدات، بەڵکو پرۆسەیەکی بڕیاردانی دوورودرێژی ژیانە و بەردەوام هەموو ڕۆژێک سەرهەڵدەداتەوە. دەکرێت پەیبردنی مرۆڤ بەم حاڵەتە وەک حوکمێکیش تەماشابکرێت، چونکە مرۆڤ هەستدەکات "هەموو جیهانی بەکۆڵداداوە"؛ "مرۆڤ بەرپرسیاری جیهان و بوونی تایبەتی خۆیەتی". سارتەر خۆشبەختانە بوونی تایبەتی خۆی بە شێوەیەکی نەرم و گونجاو ڕاگرت؛ دەیوێرا پرسیار سەبارەت بە لۆژیکی تایبەتی خۆی بوروژێنێت، یان لەپڕێکدا فەلسەفەی تایبەت بە خۆی لەژێر ناوی کەسێکی دیدا دابنێت؛ نمونەی ئەم حاڵەتە لەو کاتەدا دەبینین کە زۆر بەڕاشکاوی هاتە ناو مارکسیزمەوە؛ بێگومان ئەو کارەی هەندێ لە لایەنگرەکانی نیگەرانکرد، بەڵام بەپلەی یەکەم مارکسیە توندڕەوەکان زیاتر پێی وەڕسبوون، چونکە بەهیچ جۆرێک نەیاندەویست متمانە بە سارتەری فەیلەسوفی سەربەستی بکەن. بەڵام ئەم خاڵە بەهیچ جۆرێک کاریگەری لە سارتەر نەکرد و جۆرە جیهانبینیەکی ئاشکراکرد کە ئەمرۆکە هێندە باو نییە، هەرچەندە ئێستاکەش بیرو بۆچوونەکانی زۆر لەو سیستیمە فیکریە فەوتاوانە باشترە کە ماوەیەک لەمەوبەر بەم شێوەیە پاکانەیان بۆ خۆیان دەکرد؛ "مارکسیزم هەر زۆر زۆر لە شەکەتبوونەوە دورە، بگرە هێشتام لەهەرەتی گەنجیدایە... ئێستاکە خەریکە گەشەدەکات. مارکسیزم فەلسەفەی سەردەم و داهاتوشمانە؛ هیچ شتێک بەسەر فەلسەفەی مارکسیزمدا زاڵ نابێت، چونکە تائێستاکە هیچ شتێکمان نیە کە ئەو هەلو مەرجانە بەزێنێت کە دەبنە هۆی سەرهەڵدانی."...

(سارتەر دەیگوت "فەلسەفەی بوونگەری (ئێگزیستێنشیالیزم)، مرۆڤ دۆستییە"... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 331، 410، 487، 488*، 495)

**سپینۆزا، باروخ Spinoza، Baruch**

ژیانێکی خامۆش و گۆشەنشینی بەسەربرد. هەرچەندە لە ژیانیدا هەستی کەسی بریندار نەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ فەیلەسوفێکی تر وەکو ئەم سەرزەنش نەکراوە؛ بۆ

نمونه پێیان دەگوت "ئەو جولەکەیەی پێی خۆشە لە پاشەملە قسەبکات"، "گیانەوەرێکی ترسێنەری پیس"، "ئاژەڵێکی بیانی"، "کەسێکی سەیری شێتولکە و بەد". نە شێوازی ژیانی دەرەکی هێندەی دەهێنا بەو جۆرە سوکایەتی پێبکرێت، وە نە بنەڕەتی فەلسەفەکەشی، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمەی دواتریان بوو کە هەموو شتێکی هەڵگیرساند. سپینۆزا "1632 تا 1677" زۆربەی ژیانی لە شاری ئەمستردامدا بردەسەر، نانی ژیانیشی لەسەر سافکردن و فرۆشتنی چاوی چاویلکە پەیدا دەکرد؛ لەکۆتاییشدا بە نەخۆشی سیل مرد. هەر لە تەمەنی گەنجییەوە لەگەڵ گروپە ئاینییە جووەکاندا کەوتە ناتەباییەوە. دەیانگوت سپینۆزا لەو بڕوایەدایە پەیماننامەی کۆن "پڕبێت لە نووسینی دژ بە خۆی"، لەبەرئەمەش گروپە ئاینیەکان هەر زوو لە پەرستگا دەریانکرد، لێرەشەوە مەیلی گۆشەنشینی هێندەی تر زیادبوو. یەکەمین کتێبی بەناوی نازناوێکەوە بڵاوکردەوە و یەکسەر قەدەغەکرا، دیسانەوە بە بۆنەی ئەم کتێبەشەوە هیچ برادەرێکی پەیدا نەکرد؛ لە کتێبەکەیدا بانگەشە بۆ سەربەستی بیرکرنەوە دەکات، ئەم بابەتەش نەک هەر تەنها بەرز دەنرخێنێت، بەڵکو بە شتێکی "پێویست"یشی دادەنێت؛ چونکە هەر ئەم لایەنەیە "کە بەردەوام ڕێگەی مرۆڤ دەگرێت و ناهێڵێت ڕێک ئەو شتانە دەربڕن کە بیری لێدەکەنەوە". فەلسەفەی سپینۆزا سەبارەت بە بڕواکردنێکی پتەوە بە یەزدان؛ لێرەشەوە هێندەی تر سەیرە کە ئەو هەموو قسە سوکانەیان پێدەگوت. پێدەچێت شێوەی تێڕوانینی بۆ وێنەی خودا خەڵکانی چواردەوری هێندە تووڕەکردبێت؛ چونکە سپینۆزا دەیگوت یەزدان شتێکی گشتی مەزنە کە جیهان و هەموو شتێک و مرۆڤیشی لە خۆگرتووە؛ هەموو شتێک تەنها "شێوازی جیاواز جیاوازی بوونن" و لەناو هەمان یەزدانی تەنهادان. سپینۆزا لەم بارەیەوە نووسیویەتی؛ "بیرو بۆچوونی من سەبارەت بە خودا و سروشت، تەواو جیاوازترە لە دیدەی مەسیحییەکی ئاسایی؛ من خودا وەک سۆنگەی ناوەکی هەموو شتێک دەبینم، بەڵام نەک وەک هۆیەک کە لەو شتانە تێپەڕببێت. من دەڵێم هەموو شتێک لەناو یەزداندایە و لەناو ئەویشدا دەبزوێن". خوا خۆی لەناو ئافەریدە هەمەچەشنەکانیدا نیشاندەدات و هەرگیز خۆی ڕانەکێشاوەتەوە دواوە ـ بیرکردنەوەیەکی سەرنجڕاکێشەرە، بەڵام لەهەمان کاتدا گرفتی خۆشی هەیە؛ یەکێک لە ڕەخنەگرەکانی هاوچەرخی دەیگوت؛ "کەواتە هەموو بیرکردنەوە بێمانا و ناشیرینەکانی مرۆڤ، وە هەموو کفرە پوچەکانی ئەقڵ و هەموو خەیاڵە ترسناک و ناپەسەندەکان، دەبێت جۆرە بیرکردنەوە و وێناکردنێکی خوا بێت و لەو ڕێگایانەوە بەڕوونی خۆیمان نیشان دەدات ... وە ئێمەش ناچارین و دەبێت بڕوای پێبکەین؟"

(سپینۆزا... خودا قەرەقۆز ناجوڵێنێت... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 241، 248، 250، 263*، 277، 301، 345، 352، 372، 386، 402)

**Stalin، Josef ستالین، جوسیف**

مەرج نیە دیکتاتۆر وەک ئاژەڵێکی ناشیرین خۆی نیشانبدات و لەو ڕێگەیەوە ترس و سام بخاتە دڵی خەڵکییەوە، ستالین "1879 تا 1953" لە ڕاستیدا ناوی جیۆگاسیفیلی بوو، نمونەیەکی نایابی ئەو جۆرە دیکتاتۆرانەیە؛ ستالین، جێنشینی لینین و سەرۆکی ڕوسیا، وەک پیاوێکی دڵشاد و ڕووخۆش خۆیدەنواند، ئێواران گۆرانی خۆشی دڵتەزێنی دەگوت و حەزی لە فۆدگا خواردنەوە بوو، وە لە هەندێ بۆنەی تایبەتیشدا، هەروەک هیتلەری

هاوەڵی، پێبخۆشبوو منداڵی جوان جوان بخاتە باوەشی و وەک مامێکی میهرەبان دەست بە ڕوومەت و قژیاندا بهێنێت. ئەو کەسانەش، کە لەگەڵیدا نەدەگونجان، بەبێ ئەوەی بە هیچ شێوەیەک سەری خۆی پێیانەوە بئێشێنێت، سەرەونگومی دەکردن. مەزنی هێمنبوونی ستالین لەم خاڵەوە سەرچاوەی گرتبوو؛ ئەو دەیزانی جیهان چ شتێک پێکەوەیدەبەستێت و چ شتێکیش پێشیدەخات. ستالین خۆی تەنها وەک باوکێکی خەڵکانی ژێردەستی نەدەبینی، بەڵکو خۆی وەک کەسێک دادەنا کە بە شێوەیەکی خۆنەویستانە بیەوێت پشتگیری لە فەلسەفەبکات، هەڵبەتە فەلسەفە بەلای ئەوەوە بە پلەی یەکەم پێکهاتبوو لە فەلسەفەی مارکسی لینینی. لە بارەی گەشەپێدانی ئەو فەلسەفەیەشەوە چەند کتێبێکی گرنگی نووسی، بە تایبەتیش لە بواری زانسیتی زماندا. لە ساڵی 1950 دا توێژەرە زمانەوانەییەکانی بازنەکەی ئەو، سەبارەت بە زمان ناتەبابوون و نەیاندەزانی سەر بە چ بەشێکی کۆمەڵگایە؛ ژێرخانی کۆمەڵگا یان سەرخانی کۆمەڵگا. ستالینیش دەربارەی ئەم بابەتەی لە ڕۆژنامەکەی خۆیدا "پڕاڤدا (ڕاستی)" بەم شێوەیە نووسی؛ "ئایا ڕاستە کە زمان سەر بە سەرخانی کۆمەڵگایە؟... نەخێر ئەمە ڕاست نییە..." دواتریش وەک دەرئەنجامێک نووسیبووی؛ "زمان لەڕێگەی کۆمەڵگا جیاوازەکانەوە سەرهەڵنادات، بەڵکو لە ڕێگەی سەرتاپای مێژووی کۆمەڵگاوە دێتە بوون."

(لەم سەدەیەی خۆشماندا لینین و ستالین و ماو و چەندەهای تر بەشداری خۆیان خستە سەر مارکسیزم... جیهانی سۆفیا لاپەڕە 419)

### Stoicism ستۆیسیزم (ستۆیکەکان)

زینۆن "نزیکەی ساڵی 300 ی پێش مەسیح" بە دامەزرێنەری ئەم فەلسەفەیە دادەنرێت، ناوی "ستۆیک" لە ووشەی "ستۆیا"ی یۆنانییەوە هاتووە کە مانای "بەردەم پایە" دەبەخشێت (لە ڕاستیدا زینۆن لە بەردەمی پایەیەکی شاری ئەسینادا شاگردەکانی کۆدەکردەوە). ستۆیسیزم لە سەردەمی یۆنانی کۆندا یەکجار بڵاوبوو. بۆ ماوەیەکیش لە سەردەمی ئیمپڕاتۆری ڕۆمانیدا، بەهۆی کۆمەکی فەیلەسوفی ناوداری وەک "سێنیکا" و "مارکۆس ئاوریۆلیس"ەوە بووە فەلسەفەی سەردەم. دەتوانین بڵێین فەلسەفەی ستۆیکەکان تاڕادەیەکی زۆر سەربەست بوو، وە شتێکی ئاساییبوو گەر بیرۆکەی دەرەکی تێکەڵکێشی ڕەوتی بیرکردنەوەی خۆیان بکەن و بەکاریانبهێنن. خاڵی هەرە بنەڕەتی فەلسەفەی ستۆیسیزم یەزدان و سروشت بە "یەک" دادەنێت وە وەک هێزێکی بەدەسەڵاتی گەردوونی تەماشای دەکات، بێگومان باس لە بیرۆکەی ڕۆحی جیهان و هزری جیهانیش دەکات. مرۆڤ بەشێکی ئەو هێزە پێکدەهێنێت؛ مرۆڤ سەر بەو هێزەیە، هەرچەندە وەک تاکەکەس تەنها کاریگەرییەکی چکۆلەی لەسەر ڕێڕەوی ئەو جیهانە مەزنە هەیە کە بەپێی یاسای پێویستی سەرهەڵدەدات و دەفەوتێت. لەگەڵ ئەمەشدا ستۆیکەکان بڕوایان بە جۆرێک لە جۆرەکانی ویستی سەربەست هەیە، وە بەم شێوە فێڵبازانەیە داواکارییەکەی خۆیان دادەڕشت؛ ژیانێکی سەربەست بەپێی سروشت! ئاکاری ستۆیکی پشت بە مامناوەندێتی دەبەستێت و بەو شێوەیەش هاوسەنگیەک لە نێوان خۆپەرستی حەتمی تاکەکەس و بەرژەوەندی کۆمەڵگا دەخولقێنن.

(ناوی "ستۆیک" لە ووشەی "ستۆیا"ی یۆنانیەوە هاتووە کە مانای "بەردەم پایە" دەبەخشێ... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 142)

**Steffens، Henrik ستیفنس، هێنریک**

ئەڵمانیەکان پەیوەندیان لەگەڵ ئەم فەیلەسوفە نەرویجیەدا خۆشبوو، بەتایبەتیش ڕۆمانسیەکان. هێنریک هەموو ڕۆمانسیکانی دەناسی و تێبینی لەسەر کتێبەکانیان دەنووسی، هەندێ جاریش جۆرە زانینێکی سەبارەت بە نووسینەکان و نووسەرەکانیان ئاشکرادەکرد، کە خۆیان بە ئاگانەبوون لێی. هێنریک "1773 تا 1845" وەک پرۆفیسۆرێک لە شاری هاللە و بریسلاو و بەرلیندا کاریدەکرد. لە فەلسەفەی تایبەت بە خۆیدا لێکدژی نێوان تاکەکەس و جیهانی دەرەوەی دێنێتە سەر باس وخواس. ڕەچەڵەکی مرۆڤایەتی بە درێژایی مێژووی گەشەکردنی ئەو لێکدژەی ئەزموونکردوە و لە داهاتووشیدا ناچارانە دەبێت لەگەڵیدا بژی. دەکرێت فەلسەفە، وەک بیرکردنەوەیەکی "بەئاگا"، تەنها زانست بێت کە بتوانێت تەبایی ئەو لێکدژییە بخوڵقێنێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز تەباییەکی هاتاهەتایی نابێت.

(هێنریک ستیفنس توێژەرەوەیەکی سروشتی بوو، بەڕەچەڵەک نەرویجی بوو... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 374)

**سروش**

ئەگەر ئاگاییمان تەنها وەک بەشی بینراوی شاخێکی بەفرین بێت، وە بەشی هەرە زۆرەکەی لە خوارەوە بێت (هەر وەک تیۆری نائاگاییەکەی فرۆید باسی دەکات) کەواتە دەبێت بەلامانەوە مایەی سەرسورمان نەبێت کاتێک کە بۆچوونێک یان سروشێکمان بۆ دێت (هەرچەندە وا دەردەکەوێت کە لە هیچی نەبووەوە هەڵقوڵابێت)؛ سروشێکی بەم شێوەیە بەزۆرەملێ خۆی دەردەخات، هیچ شتێک ناتوانێت ڕێگەی لێبگرێت، وە زۆربەی کاتەکانیش بوارنادات بەقوڵی لە هۆکاری سەرهەڵدانی تێبگەین. ئەزموونە فەلسەفییە گرنگەکان (تەماشای ئاوگوستین و دیکارت و ڕوسوو بکە) پەیوەندییەکی بەم جۆرە سروشانەوە هەیە. نیتشەی فەیلەسوف پڕاوپڕترین وەسفی سروشمان بۆ دەردەخات، ئەو دەڵێت؛ "گوێت لێدەبێت، بەدوایدا ناگەڕێیت؛ بەبێئەوەی هیچ پرسیارێک لەهیچ کەسێک یان دەربارەی هیچ شتێک بکەیت، وەریدەگریت؛ هەروەک هەورەبروسکە بیرۆکەیەکی تەواو و پڕاوپڕ بەبێ هیچ دوودڵییەک خۆیت پێدەناسێنێت... من هەرگیز هیچ جۆرە چارەیەکم لەبەردەستدا نەبووە"...

(ئەمەش کاتێک ڕوودەدات کە "سەرقاپی" سەر نائاگاییمان لابردبێت. ئەمەیە کە پێی دەڵێین سروش"، سۆفیا ... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 473)

**سروشت**

چەمکی سروشت لە بنەڕەتدا دوو مانا دەبەخشێت. لە لایەکەوە بنچینەی بوونی شتێکی دیاریکراو نیشاندەدات (واتە لە سروشتی شتەکەدا، شتێکی تێدایە کە تایبەتە بەو). وە لەلایەکی تریشەوە سروشت بە مانا فراوانەکەی بەکاردێت، واتە هەموو جیهانی سروشتی

که مرۆڤیش بەشێکە لێی (هەروەک گۆتە دەڵێت؛ "سروشت هەموو شتێکە"). لە سەرەتادا مرۆڤ خۆی بە بەشێک لە سروشت دادەنا، خۆی بە ئافەریدەیەک دادەنا لە ناو ئەوانی دیدا. پاشان مرۆڤ هەستی بە جیاوازی (گەر هەبێت) خۆیکرد؛ ئاگایی مرۆڤ هاتە ناو ناوانەوە و لەم ڕوانگەیەوە چەند فەیلەسوفێک (بۆ نمونە هیگڵ) لە بەرابەری سروشتدا داینا، لە دواجاریشدا کەلتور هات و وەک خۆرێکی ڕوون و پەتی مرۆییانە خۆی نیشاندا و هەرچی شتێکیش کە پەیوەستە بە مانەوەی سروشتیی (وەک شتێکی پێویست) تێیدا دەرناکەوێت. لەلایەکی تریشەوە مرۆڤ بەتەواوەتی خۆی لە بنچینەی سروشتی دور خستۆتەوە؛ لەوەدەچێت لە سروشتی مرۆڤدا شتێک هەبێت کە ڕێگەگربێت و چیتر نەهێڵێت وەک کاتی خۆی هاوەڵی سروشت بێت. بەڵام لەبری ئەوانە دەمێکە مرۆڤ ڕۆڵی وەک ئەندازیاری سروشتی بە خۆی بەخشیوە، ئێمە سوود لە سروشت وەردەگرین، بەپێی ویستی خۆمان بەکاری دێنین، بە پێی پێویستییەکانمان دەیچەمێنینەوە، دەیکەینە شتێکی دەستکرد، فۆرمێکی تری پێدەبەخشین و بیر لەوە ناکەینەوە کە سروشت ڕۆژێک لە ڕۆژان بەبێ ئێمە توانیویەتی بمێنێتەوە و لە دوارۆژیشدا بەبێ ئێمە هەر دەتوانێت خۆی بپارێزێت ـ بەڵام پێچەوانەی ئەم حاڵەتە ڕوونادات، چونکە مرۆڤ بۆ ئەوەی لە ژیاندا بمێنێتەوە پێویستی بە سروشتە. بێگومان فەلسەفە لەم کورت بینیەدا بە تەواوەتی بێ تاوان نییە؛ فەلسەفەش بە شێوەیەک لە شێوەکان بۆتە هۆی ئەوەی ڕێزی مرۆڤ بەرامبەر سروشت وون ببێت، وە لێرەشەوە (وەک ئەنجامێک) شێوە پەیوەندییەکی موڵکداری بەرامبەر سروشت تەشەنەدەکات؛ وەک شتێکی ئاسایی و گومان لێنەکراو تەماشای ئەو حاڵەتە دەکەین کە ئێمەی پاشای سەر زەوی دەتوانین هەموو شتێک کە لەبەر دەستدایە بکەینە موڵکی خۆمان و پێداویستیەکانمانی پێ دابینبکەین. فەلسەفەی مارکسیزم و لینینیزم بیرۆکەی ئەم موڵکایەتییەی فراوانترکرد، بەڵام لە ڕاستیدا بیرۆکەکە پێشتر لەلایەن ئایدیالیزمی هیگڵەوە گەڵاڵەکرابوو، کاتێک کە سروشت وەک قۆناغێکی بەتاڵ و ناخۆشی گۆڕانی فیکر لەقەڵەم دەدرا. ئەمرۆکەش مرۆڤ، زۆربەی جار بە شێوەیەکی پێکەنیناویی یان بە جۆرە زۆر لەخۆکردنێکی گوماناوییەوە، هەوڵدەدات دیسانەوە "سروشتی ناوەوەی" خۆی بدۆزێتەوە، دەیەوێت پەی بەو هێزە کاریگەرانەی ناوەوەی ببات کە پێناسەی بوونی پێ دەڵێن. بەڵام ئەی مرۆڤ چییە ئەگەر چیتر نەتوانێت یان نەخوازێت کە بوونەوەرێکی سروشتی بێت، وە هاوکات نیشانەی پرسیار بەرامبەر "سروشتەکەی تری" دادەنێت، ئەو سروشتەی کە کۆمەڵگا و مێژوو و کەلتور تەرزی ڕەفتاری بۆ دیاریدەکەن؟

(ئەگەر سۆفیا لەو باخچەیەدا گەورەبوایە و هیچ شتێکی دەربارەی سروشت نەزانیبایە، ئاخۆ چۆن چۆنی بەهاری دەبینی؟ ... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 38*، 123، 496، 503)

### Scepticism سکێپتیسیزم (گومانکردن)

سکێپتیسیزم لە فەلسەفەدا وەک دراوێکی جێگیر و پتەو وایە؛ چونکە گومان خاسیەتێکی بنەڕەتی هەموو گومانکەرێکە و لەڕاستیدا دەتوانێت هەمیشە ڕووبەڕوی هەموو شتێکێکی بکاتەوە، لەبەرئەوە شتێکی ئاساییە کە سکێپتیسیزم وەک ڕێبازێکی فەلسەفی بە بێ هیچ گرفتێک تا ئێستاکە توانیویەتی بمێنێتەوە. یەکێک لە گومانکەرە بەناوبانگەکان

میکایل مۆنتاین "1533 تا 1592" بوو، ئەو دەیگوت؛ "ئەو کاتە فێری چۆنیەتی ژیانماندەکەن کە ژیان بەسەرچووبێت". بە سەدان قوتابی ئەریستۆتالیس شێتبوون تاوەکو گەیشتنە بەشی "ژیانی مامناوەندێتی"یەکەی سوکرات، کەچی ئەو دواتر هات و گوتی؛ "هەموو ژیان قسەیە، من هەتاوەکو ئێستاکە هیچ کەسێکم نەبینیوە کە قسەی زۆری نەکردبێت و کەم بێدەنگ بووبێت؛ نیوەی ژیانمان بە قسەکردنەوە دەڕوات."

(...بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێمەی مرۆڤ ناتوانین بگەینە یەقینێک، ناتوانین وەڵامێکی پڕاوپڕ و ڕاستی نهێنی سروشت و گەردوون بدۆزینەوە، ئەم جۆرە ڕوانگەیەش لە جیهانی فەلسەفەدا پێی دەگوترێت "سکێپتیسیزم"... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 73*، 250، 503)

## Surrealism سوریالیزم
سەروهەقیقەت خۆی بە نائاگاییەوە گرێدەداتەوە (تەماشای فرۆید بکە)، لێرەشەوە سوریالیستەکان چاوەڕوانی شتی زیاتر لە "نائاگایی" دەکەن و لە "ئاگایی"ش زیاتر متمانەی پێدەکەن. خەونیش، کە لە سەردەمی ڕۆمانتیکدا وەک کەرەسەیەکی مەعریفە بەکاردەهێنرا، "دیسانەوە" گرنگی پێ بەخشرایەوە. سوریالیستەکان (بۆ وێنە بێرگسۆن و بریتۆن و ..هتد) لایەنی "سەروهەقیقەت" بەرزدەنرخێنن، وە نۆفالیسی نووسەر و فەیلەسوف ئاماژە بۆ دیاربوونی ئەو لایەنەدەکات؛ ئەو جۆرە دیدەیەکی لە قەبری سۆفیای خۆشەویستیدا دەبینی، وە بەلایەوە وەک تەوژمی بیرکردنەوەکانی ڕاستەقینەبوو؛ "ئاسمان تاریک داهات، لە سەرەتادا هەورەتریشقە و دواتر هەور ئاسمانی گرت، ئەوجا تۆفان؛ هەستم بە هەموو شتێک دەکرد ـ ئێواران دەرۆشتمە لای سۆفیا، لەوێدا لە ڕادەبەدەر ئاسوودەبووم. چەند ساتێکی ڕوونی خۆشحاڵی؛ هەر وەک گەردێک فووم لە قەبرەکەی کرد و لەناوم برد. سەدان سەدە وەک چرکەیەک دەهاتە بەرچاو."

(سوریالیزم ووشەیەکی فەرەنسیە و دەکرێت بەرامبەر ووشەی "سەروهەقیقەت" دابنرێت... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 472)

## Socrates سوکرات
سوکرات "470 تا 399 ی پێش مەسیح" فەیلەسوفێکی پڕلەنهێنی بوو، هەر ئەم هۆیەش بۆتە مایەی ئەوەی لە مێژووی فەلسەفەدا وەک کەسایەتییەکی چالاک و سەرزیندوو بمێنێتەوە. ئێمە بیر لەو کەسانە زۆر دەکەینەوە کە زانیاریەکی کەممان دەربارەیان هەیە، وە زۆرجاریش سەرنجڕاکێشەرترن لەو کەسانەی لە چوارچێوەی چەند ڕاستییەکدا سنووردارکراون. بە پلەی یەکەم پلاتۆن بوو کە سوکراتی وەک کەسێکی مێژووی خوڵقاند، بەو شێوەیەش لە دوای مردنی مامۆستاکەیەوە بەردەوام ژیانی پێ بەخشی. لەو کاتەشەوە وێنەیەکی ناسراوی سوکراتمان بۆ ماوەتەوە؛ سوکرات هاوەڵی حیکمەتە و وەک کەسێکی سەرگەردان بە گۆڕەپان و شەقامەکانی ئەسینادا دەسوڕێتەوە و هێمنی دەشکێنێت، وا دەردەکەوێت کە کاری ئەو تەنها ئەوەندەیە کە خەڵکی ڕاکێشێتە ناو گفتوگۆوە و هیچی تر، زۆربەی جاریش بە شێوەیەکی ساکار دەست پێدەکات و دواتر هێدی هێدی قووڵدەبێتەوە. ئەم جۆرە فەلسەفە هەڵڕشتنەش لە ڕێگەی هونەری دواندنەوە (کە

سەرنجی خەڵک بەلای بابەتەکەدا ڕادەکێشێت و زۆر جاریش مشتومڕەکان جگە لە بیروڕا دەربڕینی تایبەتی کەسەکە، بۆچوونی خەڵکانی تریشی تێکەڵدەبێت) خۆی لە خۆیدا پاشتر بووە هۆی دامەزراندنی قوتابخانەیەک. هەرچەندە سوور دەیانزانی کە مۆدێلێکی ئاوها لە هەموو بارێکدا پراکتیزە ناکرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پەسەندیانکرد. ئێستاکە با بزانین ئێمە چی دەربارەی سوکراتی مێژووی دەزانین؟ باوکی سوکرات پەیکەرتاش بووە و دایکیشی مامان بووە؛ دەکرێت ئەمە وەک سیمبولێکیش تەماشابکرێت، چونکە سوکرات زۆرجار لە فەلسەفەکەیدا بەشێوەی وێنەیی قسەدەکات و باس لە "هونەری مامانی" دەکات. هونەری مامانی بریتییە لەوەی جۆرە زانینێک لە مرۆڤەوە بهێنینە دەرەوە کە بەئاگا نین لێی. سوکرات بۆ ماوەیەک کاری پەیکەرتاشی کردووە. دواتر "زانتیپە"ی ناوزڕاو و بەناوبانگی هێنا، ئەو تا بڵێیت ئافرەتێکی شەڕانی بوو و هەر وەک سوکراتیش ناشیرین بوو. سوکرات بەپێی ئەزموونی خۆی لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا، بەم شێوەیە وەڵامی ئەو کەسانەی دەدایەوە کە دەیانویست ژن بهێنن و لەو بارەیەوە داوای ئامۆژگاریان لێدەکرد؛ "هەرچۆنێک ژن بهێنیت، دواتر هەر پەشیمان دەبیتەوە!". هەرچەندە لەهەمان کاتدا لەوانەیە سوکرات سوپاسی زانتیپە بکات کە خستییە سەر ڕێگای فەلسەفی؛ لەڕاستیدا ئەو بوو کە سوکراتی لەماڵەوە دەرپەڕاندە دەرەوە، بەو شێوەیەش جگە لە فەیلەسوفی زیاتر نەیدەتوانی ببێتە هیچ شتێکی تر. بەڵام پێش ئەوە بۆ ماوەیەک سەرباز بوو؛ بەشداری شەڕی "پیلۆپۆنیزیان"ی کردووە و ئازایەتییەکی زۆری نواندووە؛ بەپێی گەواهی خەڵکانی تری ئەو سەردەمە، سوکرات لەکاتی شەڕەکەدا چەندین "هەڵسوکەوتی سەیری" هەبووە و سەرنجی خەڵکی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە. دواتر گەڕایەوە ئەسینا و بووبە ئەندامی ڕاوێژکاری شار، لێرەوە بەرە بەرە دوژمنانی سەریانهەڵدا. خاوەن دەسەڵاتەکان دەیانگوت؛ بەهرەی بۆڵەبۆڵکردنی تێدایە. هەروەها شێوەی ژیانی سوکراتیشیان بەدڵ نەبوو؛ دەیانبینی کە دەرۆشتە دەرەوە و لەگەڵ خەڵکیدا دەیفەلسەفاند، بە تایبەتیش زیاتر لەوە دەترسان کە بیربۆچوونی زیانبەخش بهێنێتە ئاراوە. لە دواجاردا بە تاوانی بێخودایی و فریودانی گەنجان تاوانباریانکرد. هەندێک لەو خێرخوازانەی کە بەردەوام بڕوایان بە سوکرات هەبوو، هەوڵیاندەدا قەناعەتی پێبکەن؛ دەکرا شار بەجێبهێڵێت و بەو شێوەیەش لەو حوکمە سەختە قورتاربێت. بەڵام سوکراتی فەیلەسوف کەللەڕەق بوو، هەستی دەکرد هیچ گوناحێکی نەکردووە و لە دادگادا بەرەنگاری لەخۆیکرد و وتە بەناوبانگەکانی گوت؛ "هەتاوەکو ئەو کاتەی ئەتوانم هەناسە هەڵبکێشم، نامەوێت دەست لە فەلسەفە کردن هەڵبگرم، لە هەمان کاتدا دەخوازم لە شتێک ئاگادارتان بکەمەوە و بڵێم بەرامبەر هەر کەسێکتان بوەستم، من هەر کتومت بەو شێوەیە دەدوێم کە ڕاهاتووم..." دواتریش دەڵێت؛ "نابێت گوێ بۆ قسەی سەروەرەکان شلبکەین، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبێت گوێ بۆ گوتەی ئەو کەسە شلبکەین کە دەزانێت هەق و ناهەق چییە؛ کە ئاشنای تاکەکەس و خودی هەقیقەتە." لە کۆتایدا وادەرکەوت کە سوکراتی فەیلەسوف بخوازێت ڕاستەوخۆ چارەنووسی حوکمدانی خۆی بنەخشێنێت؛ واتە دەبوایە حوکم بدرایە. حوکمی کوشتنی سوکراتیان دەرکرد؛ ژەهرەکەی خواردەوە و داوای لە هاوەڵەکانی کرد کە جێیبهێڵن. دەڵێن دوا ووشەکانی ئەمانە بووە؛ "ئێستاکە کاتی خۆیەتی؛ کاتی ئەوە هاتووە من بمرم و ئێوەش بژین. جگە لە یەزدان، کەسی تر نازانێت کام یەکەمان باشتر دەیگوزەرێنێت."

(لەوانەیە سوکرات... بە نهێنیترین کەسی هەموو مێژووی فەلسەفە دابنرێت... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 67، 72، 74*، 75، 85، 92، 99، 102، 134، 137، 140، 143، 145، 177، 191،195،249، 255، 260، 265، 278، 296، 312، 335، 404، 409، 418، 470، 495، 546)

**Cicero، Marius Tullius سیسیرۆ، ماریۆس تۆلیۆس**

سیسیرۆ "106 تا 43ی پێش مەسیح"ی فەیلەسوف و پیاوی بەناوبانگی وڵات، ژیانێکی نائارامی بەسەربرد، لەو کاتەدابوو کە ڕامیاریی هەوڵی جوڵانی مێشکی دەدا و فەلسەفەش هەوڵی هێمن کردنەوەی. سیسیرۆ ڕۆڵی وەزیری دەبینی و ئەرکی سەر شانی سەرکوتکردنی هەڵگەڕانەوەی "کاتلین"(*ناوێکی لاتینیە؛ سیرجیۆس کاتلینی ڕۆمانی لەساڵی 63ی پێش مەسیحدا لە وڵات هەڵگەڕایەوە ـو) بوو. سیسیرۆ تەنها لە کاتی شەڕی ناوخۆیدا، بۆ ماوەیەکی کەم، پشتگیری لایەنێکی هەڵەیکرد، بەڵام دەرسێکی مێژوویی لێوە وەرگرت، چونکە" سێزار" سەرکەوت و مان و نەمانی کەوتە بەر ڕەحمەتی ئەو. وەک فەیلەسوفیش، سیسیرۆ برادەری یۆنانیەکانبوو، لەلای ئەوان تا ڕادەیەک بەڕاشکاوی دەربارەی ئەو بابەتانە دەدوا کە زیاتر لەگەڵ بیروڕای خۆیدا دەگونجا؛ ئەو پرسیارە بنچینەییانەی کە بەلای ئەوەوە گرنگبوون، بابەتی مردن و ژیان و هاوڕێیەتی و خۆشەویستی و نەمرییبوو. بەلای سیسیرۆوە، فەلسەفە گەیشتن بە حیکمەتی ژیانە و بەردەوامیش هەوڵیدەدا بەو حیکمەتە بگات. دەڵێن نووسینێکی (کە نەماوە و ناوی "هۆرتنسیوس بووە") کاریگەریەکی گەورەی لە سەر ئاوگوستین هەبووە و خستویەتیە سەر ڕێگای ئەندێشەی قوڵ.

(چەند سەدەیەک پاش ئەو، فەیلەسوفێکی ڕۆمی "سیسیرۆ" گوتی سوکرات فەلسەفەی لە ئاسمانەوە هێنایە سەر زەوی و... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 77*، 142)

**Thucydides سیۆسایدیدس**

سیۆسایدیدس "450 تا 400ی پێش مەسیح" تەنها مێژوو نووس نەبوو، بەڵکو بەرپرسیاری هێزی دەریایش بوو، لە کاتی شەڕی "پیلۆپۆنیس"ەکاندا لایەنگری ئەسینابیەکانی گرت و دژی "سپارتا"کان جەنگا، بەڵام لەو کارەیدا سەرنەکەوت؛ سەرۆکەکەی تاوانی ترسنۆکی دایە پاڵی، چونکە دەبوایە کۆڵۆنی "ئامفیپۆلیس" بپارێزێت، بەڵام سپارتاکان داگیریانکرد و ئەمیش دەستەوەستان وەستابوو. سیۆکایدیس دوورخرایەوە و لێرەشەوە کاتێکی باشی کەوتە بەردەست و تەرخانیکرد بۆ نووسین. وەک مێژوونووسێکیش سیۆسایدیدس بە ڕاستودروستی ناسراوە. ئەو نە لێکدانەوەی سەروسروشتی و نە خەملاندنی بابەتەکانی پێخۆشبوو، وە نەیدەویست باسی دەست تێوەردانی خواکان لە ڕەوڕەوەی مێژوودا بکات، بەڵکو بە پێچەوانەی هیرۆدێتی هاوەڵیەوە بەتەواوەتی دژی دەرس پێدانبوو و لەبری ئەوە سەرگوزەشتەی خۆشی دەهێنایەوە .

(بەناوبانگترین مێژوونووسی یۆنانیش هیرۆدۆت و سیۆسایدیدس بوون... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 64)

### سێنێکا Seneca

هەموو شتێک لە فەلسەفەدا دەگونجێت، تەنانەت (یان لە ڕاستیدا) ڕێک ئەو حاڵەتەش کە دوو بیرو بۆچوونی تەواو لێکدژ بە تەنیشت یەکەوە دەبن؛ سێنێکا دەیگوت "مرۆڤ شتێکی پیرۆزە بۆ مرۆڤ"، ئەم گوتەیە دواتر لە ڕوانگەیەکی نوێوە و بوو بە "مرۆڤ بەرامبەر بە یەکتری وەک گورگن (هۆبیس)"، بەڵام هەمیشە کە سێ فەیلەسوف کۆدەبنەوە بەلایەنی کەمەوە چوار بۆچوونی جیاواز بەرامبەر شتەکان دەخەنەڕوو، وە تەنها پێنجەم یان شەشهەم بۆچوونیان ڕاستە.

سێنێکا "نزیکەی 4 ی پێش مەسیح تا 65 ی پاش مەسیح" نمونەیەکی تری شێوەی ژیانی ئەو فەیلەسوفانەمان نیشاندەدات کە دەچنە ناو بواری ڕامیارییەوە (تەماشای مارکۆس ئاورێلیوس بکە)، هەڵبەتە لە زۆربەی بارەکاندا نابێتە مایەی ئاسوودەییان. ئەم چەندین پلەوپایەی ڕەسمی بەرزی هەبوو، وە مامۆستای "نیرۆ"ی ئیمپراتۆری ڕۆمانی بوو؛ ئەمەش خۆی لەخۆیدا هەتا بڵێیت کارێکی سەخت و دژواربوو، وە بەشێوەیەکی تراجیدیش کۆتایی پێهات؛ نیرۆی ستەمکار فەرمانی پێکرد خۆی بکوژێت، ئەویش ئەنجامی دا (بێگومان ئەگەر مامۆستاکەی فەرمانێکی ئاوهای بدایە بە قوتابیەکەی، ئەوا هێندە گوێڕایەڵی نەدەبوو). سێنێکا لە بواری فەلسەفەدا لایەنگری ستۆیکەکانبوو. ئەم (کەم تا زۆر) بڕوای بە دەسەڵاتی ئەقڵ هەبوو، بەڵام بەلایەوە گرنگبوو (بۆ بەرژەوەندی گشتی) کە مرۆڤ بەسەر بیرکردنەوە و هەوەس و ئارەزووەکانیدا زاڵبێت. سێنێکا لە ڕستەیەکی جوانیدا دەڵێت؛ "لە گۆشەیەکی تاریکیشەوە دەتوانین بەرەو ئاسمان خۆمان هەڵبدەین."

(سێنێکا، کە فەیلەسوفێکی ستۆیکی بوو، چەند ساڵێک دواتر گوتی؛ "مرۆڤ شتێکی پیرۆزە بۆ مرۆڤ". جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 143)

### سەدەکانی ناوەڕاست

زاراوەی سەدەکانی ناوەڕاست تاڕادەیەک ماوەیەکی زەمەنی دورودرێژ دەگرێتەوە؛ لە سەدەی پێنجەمەوە درێژدەبێتەوە تا دەگاتە سەدەی شانزە. ماوەیەکی دورودرێژی ئاوهاش پێویستی بەدابەشکردن دەبێت، هەر لەبەرئەم هۆیەش بەم شێوەیە دابەشکراوە؛ سەدەکانی ناوەڕاستی سەرەتا (لە سەدەی پێنجەوەتا سەدەی دەهەم دەگرێتەوە)، سەدەکانی ناوەڕاستی دواتر (لە سەدەی یانزەوە تا ناوەڕاستی سەدەی سیانزە)، وە سەدەکانی ناوەڕاستی پاشینە (لە ناوەڕاستی سەدەی سیانزەوە تا سەرەتای سەدەی شانزە). بۆ ماوەیەکی دورودرێژ ناوی "سەدەکانی ناوەڕاستی تاریک" یان بەسەر سەدەکانی ناوەڕاستدا سەپاندبوو، بێگومان ئەو ناوە لە سەدەی ڕۆشنگەریدا سەریهەڵدا و دواتریش بوو بە دەستەواژەیەک کە بەردەوام دووبارە دەکرایەوە. بەڵام هێدی هێدی تێگەیشتنێکی جیاواز سەبارەت بە سەدەکانی ناوەڕاست دەرکەوت. ئەمرۆکە بەدڵنیاییەوە دەزانین کە هەموو شتێکی سەدەکانی ناوەڕاست لە ڕاستیدا تاریک نەبووە. بۆ نمونە بیرۆکەی وەک "خۆشەویستی مەزن" بۆ یەکەمین جار لە سەدەکانی ناوەڕاستی دواتردا داهێنرا، ئەمەش بیرۆکەیەکە کە تا ئێستاکەش ـ لەوانەیە ئێستاکە کەمێک ئاگادارتربین ـ پێوەی دەناڵێنین...

(سەدەکانی ناوەڕاست... بڕینی کەمێکی ڕێگاکە مانای ئەوە نییە ڕێگای هەڵەت گرتبێت... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 177)

**سەدەی ڕۆشنگەری**

سەدەی ڕۆشنگەری سەدەی 17 و 18 دەگرێتەوە. لەو ماوەیەدا شێوە بیرکردنەوەیەکی تایبەت سەریهەڵدا کە پەیوەستبوو بە ئەقڵەوە. کانتی فەیلەسوف بەم جۆرەی خوارەوە وەسفی ناواخنی ڕۆشنبوونەوەی دەکرد و لەو کاتەشەوە وەک پێناسەیەکی کلاسیکی مایەوە؛ "ڕۆشنبوونەوە واتە هاتنە دەرەوە لەو ناکامڵییەی مرۆڤ کە خۆی بۆ خۆی خوڵقاندوویەتی. ناکامڵی بەو مانایەی کە مرۆڤ تەنها ئەو کاتە دەتوانێت ئەقڵی بەکاربهێنێت کە کەسێکی تر بۆی بەڕێوە دەبات". کاتێک ناکامڵی کۆتایی پێهات و کامڵی سەریهەڵدا، ئەو کاتە ئەقڵ لەو ڕاستیە تێگەیشت کە خۆگونجاندن لە جیهاندا چەندە سەختە ئەگەر "کەسێکی تر بەڕێوەی نەبات"، چونکە ئەو کاتە چیتر هیچ دەسەڵاتێک (کە لەلایەن خۆمانەوە هەڵبژێردراوە) نامێنێتەوە کە مرۆڤ خۆی پێوە ببەستێتەوە و هەموو توانای پەیبردن بەرەو ڕووی خود دەکرێتەوە. ئەمەش لە هەمان کاتدا هەم سەختە و هەم بەربەرەکانێیەکی مەزنیشە.

(سەدەی ڕۆشنگەری... لە شێوەی دەرزی دروستکردنەوە، هەتا شێوەی تۆپ داڕشتن.. جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 322)

**سەربەستی**

زۆرجار کە مرۆڤ بە ئەندازەی پێویست کات و هێمنی هەبێت و غەم و پەژارەی مەزنی بوونی نەبێت، وا هەستدەکات کە سەربەست بێت. واتە ئەو کاتە مرۆڤ لەو بڕوایەشدایە کە خاوەنی ویستێکی سەربەستیشە (هەرچەندە ئەمە تەنها جۆرە بڕوایەکە و هەمووان خاوەنی نین). بەم شێوەیەش سەربەستی بە توانای بنچینەیی مرۆڤ دادەنرێت کە لە ڕێگەیەوە دەتوانێت دەسەڵاتی بەسەر خۆیدا بشکێتەوە. ئەم توانای بڕیاردانەش، کە هەردوو لایەنی جەستەیی و هزریش دەگرێتەوە، لە سەردەمی مێژووی نوێدا بووە بە بیرۆکەیەکی هێندە پێویست کە بە هیچ جۆرێک بواری گۆڕانکاری نییە. سەربەستی ئەو کاتە دەبێتە هۆی گرفت کە لە بازنەی تاکە کەس دێتە دەرەوە کە داوایدەکات، وە دەبێت هەموو کۆمەڵگا بگرێتەوە، بەڵکو لەڕاستیدا دەبێت هەموو وڵات و کۆمەڵی خەڵکان بگرێتەوە. لێرەشەوە سەربەستی دەبێتە بابەتێکی مشتومڕ لەسەرکراو، دەبێتە ووشەیەک کە بە شێوەی جیاواز جیاواز دەگوترێت، بۆ نمونە لای خاوەن دەسەڵاتداران شتێکە و لەسەر زاری کەسانی چەوساوەش تەواو شتێکی ترە. پێدەچێت لە هەموو مێژووی فەلسەفەدا ئایدیالیزمی ئەڵمانی دیارترین گەشەی بە زاراوەی سەربەستی دابێت؛ خاڵی پوخت و نایابی ئەم شێوە سەربەستییە لەوەدا دەردەکەوێت کە ناسەربەستی دەرەکی بە سەربەستییەکی مەزنی بیرکردنەوەی ناوەکییەوە (*خۆییەوە) گرێدەداتەوە، لێرەشەوە بوارێکی هێندە فراوان و وردبینین دێتە کایەوە کە ئاستەمە شێوەیەکی گشتیتر بوونی هەبێت. لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا خەڵکی بەشێوەیەکی ڕاستەقینەتر بیرۆکەی سەربەستییان هەڵدەسەنگاند. ئەمرۆکەش دەبێت هێندە بزانین کە سەربەستی بریتی نییە لە تەنها ووشەیەک، یان شتێک کە پێویستە و زۆرجاریش پێشێلدەکرێت، بەڵکو دەبێت نیشانەی پرسیاریشی بخرێتە بەردەم، بەتایبەتی کاتێک (بۆ نمونە لەو وڵاتانەی

کە پێیان دەگوترێت جیهانی سێهەم یان چوارەم) کە وەک شتێکی نەسەلمێنراو دەخرێتە بەردەم خەڵکی؛ ئەو خەڵکانەی کە تەنها مانەوەیان لە ژیاندا مانایەکی زۆر فراوانتری هەیە وەک لە زاراوەیەکی وەک سەربەستی.

(بەڵام تەنها ئەو کاتە بە "سەربەستی" ڕەفتاردەکەین کە بەپێی یاساى مۆراڵ دەجوڵێینەوە... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 358)

### Baroque Period سەردەمی بارۆک

بە پلەی یەکەم، وەک ماوەیەکی مێژوویی هزر، سەدەی هەڤدە دەگرێتەوە. لەو سەردەمەدا هەستی گشتی ژیانی ڕۆژانە ئەزموونەکانی شەڕی سی ساڵەی پێوە دیاربوو. مردن و وێرانکاری شانبەشانی هیوای ئامێزکردنەوە بۆ ژیان دەڕۆیشتن. هەرچی دەربارەی یەزدانیشە دەیانگوت ئێستاکە دیسانەوە شوێنی خۆی لەخوار (یان لەسەر) مرۆڤەوە دۆزیوەتەوە. دوو ڕستەی لاتینی گرنگ خاڵی سەرەکی شێوەی ژیانی سەردەمی بارۆکیان نیشاندەدا، ناواخنی ئەو دوو ڕستەیەش پارسەنگی نێوان ترس و ئاسودەیی ڕاگرتبوو؛ یەکەم ڕستە دەیانگوت "لەیادت نەچێت کە هەر دەمریت" وە دووهەمیشیان "چێژ لە ڕۆژەکەت ببینە."

(سەردەمی بارۆک... لەهەمان قوماش کە خەونی لێچنراوە... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 231)

### Shakespeare، William شکسپیر، ویلیەم

ئەم نووسەرە بەریتانیە "1564 تا 1616"، هەر وەک گۆتەی نووسەر، بەشداری خۆی خستە سەر فەلسەفە؛ چەندین بیروڕای وورد و زیرەکانەی هێنایە ناو جیهانی فەلسەفەوە؛ هەڵبەتە بەلای خودی فەلسەفەوە هێندە سەرنجڕاکێش نەبوو، چونکە فەلسەفە وەک "فۆرمێکی پرکێشە و بەگومان" خۆی دەردەخات و "لەچوارچێوەی هزردا" ماوەتەوە، وە هەمیشەش "کەمێک بێدەنگی" پێوە دیارە، بەو شێوەیەش فەلسەفە، گەر لەگەڵ وەرزەکانی ساڵدا بیشوبهێنین، لە "زستانێکی سەخت و ناخۆش" زیاتر هیچی تر نییە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا نابێت دەست لە فەلسەفە و بیرکردنەوە هەڵبگرین، چونکە "هیچ شتێک خۆی لە خۆیدا نە باشە و نە خراپیشە، بەڵکو شێوەی تێڕوانین و بیرکردنەوەکانمان وایان لێدەکەن"...

(بەڵام هەر لەسەرەتاوە کارەکانی شکسپیر پڕبوون لەوەی کە دەڵێ ژیان وەک شانۆیەک وایە... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 244)

### Schiller، Friedrich شیللەر، فریدریک

شیللەر "1759 تا 1805" لەڕادەبەدەر سەرسامی فەلسەفەی کانت بوو، وە پێیوابوو بتوانێت باشتری بکات. بەتایبەتیش "یاسای مۆڕاڵی" کانتی بەدڵ نەبوو؛ لە ڕوانگەی

ئەمەوە کانت زیاتر جەختی لەسەر "ئەرک" دەکرد و کەمتریش لەسەر "ویست". بە بڕوای ئەم هەڵسوکەوتێکی مۆراڵی دەبێت لە سەر بنەمای ویست ڕووبدات؛ بەو شێوەیەش هەستی "ئەرک" مرۆڤانەتر دەبێت. یەکێک لە بیرە سەرنج ڕاکێشەرەکانی شیللەر دەربارەی "ئارەزووی یاری" کردنی مرۆڤە؛ "شتە خۆشەکان و شتە باشەکان و شتە پڕاوپڕەکان بەلای مرۆڤەوە تەنها شتێکی گرنگن و هیچی تر، بەڵام مرۆڤ یاری بە شتە جوانەکان دەکات... بۆ ئەوەی بەکورتی و بە تەواوەتی بیڵێین؛ مرۆڤ تەنها ئەو کاتە یاری دەکات کە بە مانای ووشە مرۆڤ بێت، وە تەنها ئەو کاتە بەتەواوەتی مرۆڤە کە یاری دەکات". پاش ماوەیەکی کەم شیللەر بەو پەڕی قەناعەتەوە دەستی لە جیهانی فەلسەفە هەڵگرت و گەڕایەوە سەر هونەری شیعر، ئەو دەیگوت؛ "بەلایەنی کەمەوە لە شتێک دڵنیام؛ تەنها مرۆڤی ڕاست شاعیرەکانن، وە باشترین فەیلەسوفیش لە بەرامبەریاندا وەک کاریکاتۆرێک وایە."

(شیللەری شاعیری ئەڵمانیش گەشەی بە بیرکردنەوەکانی کانت دا... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 369)

## Schelling، Friedrich Wilhelm شێللینگ، فریدریک ویلیەم

وەک گەنجێکی بلیمەت بە چەپڵە و ئافەرین پێشوازی لێدەکرا؛ بەڵام دواتر کە کەوتە تەمەنەوە، بەرەنگاری ڕەخنەیەکی توندو تیژی ناخۆش بووەوە. شێللینگ "1775 تا 1854" بەچاوی خۆی هیگڵی هاوەڵی خوێندنگای خۆی بینی کە ناوبانگی دەرکرد، ئەگەرچی هەرگیز مەزنەی ئەوەی نەدەکرد کە لە خۆی زیاتر ناوبانگ دەربکات. ئەمەش کاریگەری لێکرد و زۆرجار هەستیدەکرد بەهەڵە لێی تێدەگەن. لە فەلسەفەکەیدا مێژووی گەشەکردنی ئەندێشەی وەک گۆڕانکاریەکی ئاشکرا و ڕوون دەردەکەوێت؛ لە تەمەنی گەنجیدا هەست و خرۆشیەکی ڕۆحانی بە بیرکردنەوەکانیەوە دیارە، بەڵام ئەندێشەی ساتەکانی تەمەن هەڵچوونی سیمایەکی سەختی پێوە دیارە.

لە پاش تەواوکردنی خوێندنەکەی وەک مامۆستایەکی تایبەتی لە ماڵاندا کاریدەکرد؛ دواتر لە تەمەنی گەنجیدا لە شاری جینادا بووە پرۆفیسۆر، لە وێدا بوو کە ئاشنایی لەگەڵ کەسایەتییە بەناوبانگەکانی ڕۆمانسی ئەڵمانیدا پەیداکرد. پاشانیش وەک پرۆفیسۆرێک لەشاری ۆرزبێرگ و میونشن و ئێرلانگدا کاریکرد. لە ساڵی 1841 دا بانگیانکرد بۆ شاری بەرلین؛ بەتایبەتی بۆ "ڕیشەکێشکردنی ڕەگی هیگڵینیزمی". ئەم کارەش، هەرچەندە لە ڕاستیدا ڕوون نییە کە هەر ڕووشیدابێت، بەتەواوەتی شکستی هێنا؛ شێللینگ لە سەرەتادا، بە هۆی ناوبانگی پێشینەیەوە، لەکاتی وانە گووتنەوەدا تەواوی هۆڵەکەی پڕ دەبوو لە خەڵک، بەڵام دواتر گۆێگرانی بەهۆی "وشکییەکی زۆری بابەتەکەی" و دوودرێژی و ئاڵۆزی بابەتەکانیەوە وەرسدەبوون و لە کاتی وانە خوێندنەوەیدا نزیکەی نیوەی هۆڵەکەی بەتاڵبوو. لە ساڵی 1846 دا وەک ئەکادیمییەک وازی لە وانەگوتنەوە هێنا و لەوە بەدواوە تەنها وەک مامۆستایەکی تایبەتی وانەی دەگوتەوە.

شێللینگ لە ئایدیالیزمی ئەڵمانیدا ڕۆڵی فەیلەسوفێکی سروشتی دەبینی، بێگومان هەستیدەکرد ئەو ڕۆڵە جۆرە کەمنرخاندنێکی تێدابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جۆرە

ڕوانگەیەکی سەربەخۆیی بە سروشت بەخشی کە هیگڵ و فیختەی هاوەڵی نەیانتوانی پێیببەخشن. شێللینگ سروشت و ڕۆحی پێکەوە گرێدا؛ ئەو بەم شێوەیە پرسیاری دەکرد؛ چۆن چۆنی سروشت و ڕۆح نەک تەنها شان بەشانی یەک بوونیان هەیە، بەڵکو کاریگەری لەسەریەک جێدەهێڵن و تێکەڵی یەکیش دەبن ـ واتە بە چ شێوەیەک "ڕەورەوەی سروشت... لەدەرەوەی ئێمەدا بوونی هەیە" و لە هەمان کاتیشدا "ڕێگایەکی بۆ ناو ڕۆحمان دۆزیوەتەوە". لە سەرو ئەوەشەوە شێللینگی ئایدیالیست ڕەخنە لە ئایدیالیزمێک دەگرێت کە بنچینەی خۆی تاوتوێ ناکات وە لێرەشەوە "تەنها تارادەیەک" دەبێتە "شتێک کە شیاوی لێکدانەوەبێت". جگە لەمانەش لە فەلسەفەی سەرەتایی شێللینگدا هونەر ڕۆڵێکی تایبەتی دەبینی؛ هونەر و "هێزی خەیاڵ" پێکەوە هێزێکی سێهەمی ڕێکخەر پێکدەهێنن کە دەتوانێت سروشت و سەربەستی بکاتە یەک. بەڵام دواتر چیتر پشتی بەو تێڕوانینە نەدەبەست؛ ئەندێشەی قووڵی بەگوڕ خستە سەر شێوە هەڵسەنگاندنێکی فرەلایەن، کە سەبارەت بە پەیوەندی نێوان هزر و سەربەستی بوو. ئەو، بە بەراوردکردنی لەگەڵ پێشینەکانیدا، بە گومانێکی زۆرەوە تەماشای ئەو پەیوەندییەی دەکرد؛ هەقیقەتێک کە چیتر یان هێشتام وەک وێنەیەکی ئەقڵی هیچ شێوەیەکی نەبێت، کۆمەڵە بیرکردنەوەیەکی نەگوتراو لە هزردا جێدەهێڵێت؛ کەواتە دەبێت هەقیقەت شتێکی "گشتیتر و گەورەتر" بێت لەو تێڕوانینەی کە هەوڵدەدات وەسفی بکات. هەرچەندە فەلسەفەی دواتری شێللینگ بە شێوەیەکی داخراو دێتە پێشچاو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەندەها بیرکردنەوەی نائاسایی لە خۆگرتووە ـ بۆ نمونە کاتێک باسی "خورپەی پەیبردن" دەکات، ئەو کاتەی کە سروشت لە ناو مرۆڤدا چاوی دەکاتەوە و دەیەوێت بڵێت سروشت بوونی هەیە" ،سروشت لێرەدایە ".

(شێللینگ "ڕۆحی جیهانی" لە سروشتدا دەبینی، بەڵام لە هەمان کاتیشدا هەمان "ڕۆحی جیهانی" لە ئاگایی مرۆڤیشدا بەدیدەکرد... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 373*، 377، 381، 385، 388، 404، 418)

### Freud، Sigmund فرۆید، سیگمۆند

فرۆیدی بنچینە دانەری شیکردنەوەی دەروونی، پزیشک و دەروونناس و فەیلەسوف بوو. لەسەرەتادا فرۆید سەرنج و تێڕوانینەکانی لە جۆرە میتۆدێکدا کۆکردەوە کە بۆ چاککردنەوەی کەسانی نەخۆش بەکاریبهێنێت، بەڵام دواتر دەرکەوت کە بۆ چارەسەرکردنی کەسانی ساغیش دەستدەدات. نزیکەی 79 ساڵ "1856 تا 1939" لە شاری ڤێنادا ژیا و خۆی وا هەستیدەکرد کە شاری نیشتەجێبوونی بێت، بەڵام دواتر لە دەستی نازیستەکان هەڵهات و بەرەو لەندەن کۆچیکرد. سەرکەوتوویی شیکردنەوەی دەرونی ( کە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا گەشەی پێدراوە) بەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە ڕێگەی جۆرە لێکدانەوەیەکەوە هاریکاری ئاگایی مرۆڤ دەکات (کە زۆرجار وا دێتە پێشچاو کە یەکجار پەرشوبڵاوە) و نائاگایی مرۆڤ دەکاتە بەرپرسیاری هەموو گرفتەکان. دەتوانین بڵێین نائاگایی لە ژوورێکی گەورەی فیکری دەچێت کە هەموو شتێک لە ناویدا نقوومدەبێت و دەتوێتەوە، بۆ نمونە؛ غەریزە ئاڵۆزەکان، زانیاریە بەکارهاتووەکان، هەستی پڕ لە دڵەڕاوکێ، چەندەها ویست و خواستی هەمەچەشن،

پاشمەوەی خەونەکان، هەموو شێوە هەڵسوکەوتێک کە دەبنە هۆی بەرپەرچدانەوە کوتوپڕەکان، وە بەتایبەتیش هەموو ئەو هەڵە سەیرو سەمەرانەی کە مرۆڤ بەدرێژایی ژیانی دەبێتە قوربانیان. دۆزینەوەی نائاگایی، کە فرۆید نەیدەتوانی مافی دۆزینەوەی بە خۆی ببەخشێت (چەندەها زانای تر لەم بوارەدا لەپێش ئەوەوە هەنگاویان ناوە، بۆ نمونە شۆپنهاوەری فەیلەسوف)، دەروونی مرۆڤی زیاتر ڕوونکردەوە، لەوەش زیاتر دەروونی کردە بابەتێک کە لەوەودواوە ڕێگەی چارەسەرکردنی بە شێوەیەکی ڕێکوپێک بۆ خۆشکرد. لێرەدا بەشێوەیەکی گشتی دەروون بەسەر "بەشی نائاگا و بەشی پێش ئاگا و بەشی ئاگا" دابەشدەکرێت، ئەمەش بنەڕەتی پێکهاتەی پێناسەی خودی تاکەکەس پێکدەهێنێت. لەلایەکی تریشەوە فرۆید دەڵێت پێناسەی خود پشت بە "خود" دەبەستێت (کە لە غەریزە و پێداویستیە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ پێکهاتووە)، هەروەها پشت بە "سەرو ـ خود"ی خاوەن هێزیش دەبەستێت (لێرەدا مەبەست لە فشاری هەموو ئەو چاوەڕوانکردن و داواکاریانەیە کە تاکە کەس لەناوەوەیدا خولیایەتی). لە نێوان ئەو دوو لایەنەی دەرووندا بەربەرەکانێیەکی تووند دەردەکەوێت کە لەسەر کۆمەڵێک یاسا دەچێت بەرێوە، ئەو یاسایانەش هەمووکات تاکە کەس لێیانتێناگات، بەڵکو لە ڕاستیدا زۆر بەدەگمەن هەڵدەکەوێت کە پێیان بزانێت. کاتێک کە کەسێک هەست بە بێزاریدەکات، ئەو کاتە پێویستی بە دەروناسێک دەبێت کە لە ڕێگەی شیکارییەوە گریمانەکانی بکاتە زانیاریەکی چەسپاو. هەندێ لە شیکەرەوە دەروونیەکان سەرکەوتوانە دەتوانن بەدوای دیاردە دەروونیەکاندا بگەڕێن و بیاندۆزنەوە، لێرەدا نەخۆشەکە دەخەنە بەر شیکردنەوە دەروونیەکانی خۆیانەوە و لێرەشەوە دەتوانین بڵێین مۆدێلی مەعریفی دەروونناسی قوڵ تاڕادەیەک سەرکەوتنێکی باشی بەدەستهێناوە؛ زاراوەکانی فرۆید هەر زوو جێگەی خۆی لە ناو زمانی ڕۆژانەدا کردەوە، بەتایبەتیش گەر مەبەست بێت دیاردە دەروونیەکان بەشێوەیەکی شیاو و پراوپڕ تەفسیربکرێن. بەهەمان شێوە ئاکامی لێکۆڵینەوەکانی تری فرۆیدیش جێگەی گرنگی خۆیانگرت، بۆ نمونە دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان نوکتە و نائاگای (کە تەنانەت خراپترین نوکتەبازیش هانای بۆ دەبات) هەروەک "پرێنسیپی هەقیقەتی" فرۆیدی بڵاوبووەوە و بووە بابەتێکی ئاسایی. بێگومان "پرێنسیپی هەقیقەتی فرۆیدی" لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەدا بەکاردەهێنرێت کە نایانەوێت بەئاسانی دەست لە هەموو خەونە بێسوودەکانی ڕۆژانەیان هەڵگرن یان گەرەکیان نیە واز لە بیرۆکە و ئارەزووی بێمانا و بیرکردنەوە شێتانەکانیان بهێنن. بەشێوەیەکی گشتی شیکردنەوەی خەونی فرۆیدی، کە لەڕێگەی لێکدانەوەی چەند سیمبولێکی دیاریکراوەوە هەوڵدەدات ناواخنێکی شاراوە ئاشکرابکات، گرنگی خۆی سەلماند و کاریگەری لەسەر چەندین بواری زانستی تردا بەجێهێشت.

(لێکۆڵینەوەکانی فرۆیدیش لەسەر نائاگایی، نیشانیدا کە هەڵسوکەوتی مرۆڤ زۆرجاران سەرچاوە لە هەندێ ماکی "ئاژەڵیەوە" وەردەگرێت... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 331، 433*، 458)

### فیختە، جۆهان گۆتلیب Fichte، Johann Gottlieb

فیختە "1762 تا 1814" بە بۆنەی ڕێکەوتێکەوە هاتە ناو دونیای فەلسەفەوە. کوڕی وەستایەکی هەژار بوو، بەڵام ڕێکخراوێکی تایبەتی کۆمەکی داراییان کرد و توانی

پێبخاتە ناو قوتابخانەوە، دواتریش لە دانیشگایەکدا دەستیکرد بە خوێندنی تیۆلۆجی. دەستکورتی و نەهامەتی دارایی بەدرێژایی ژیانی بەدواوەی بوو. هەروەک زۆرینەی هاوەڵەکانی ناچاربوو وەک مامۆستایەکی تایبەتی لە ماڵاندا کاربکات و کەمێک پارە پەیدابکات. ڕۆژێکیان یەکێک لە قوتابیەکانی دەیەوێت چەند زانیارییەک دەربارەی فەلسەفەی کانت بزانێت. لێرەوە فیختە، کە تا ئەو کاتە هیچ شتێکی تایبەتی دەربارەی فەلسەفە نەدەزانی، دەکەوێتە ناو جیهانی فەلسەفەوە و دەستوبرد دەستدەکات بە خوێنینەوەی فەلسەفی. شەوڕۆژ بێوچان فەلسەفەی کانت دەخوێنێتەوە و هەر لەسەرەتاوە بەشێوەیەکی پڕاوپڕ لە بنچینەوە ڕاڤەیدەکات. دواتریش ئەو هاتنە ڕێکەوتەی بۆ ناو دونیای فەلسەفە، بە ئەنجامێکی باش و گونجاوی گەیاند؛ فیختە، کە لەو کاتەدا پەیوەندی بە کانتی میهرەبانەوە گرتبوو، داوای یارمەتی لێدەکات کە دەزگایەکی چاپ و پەخشی بۆ بدۆزێتەوە و یەکەمین کتێبی، کە ناوی "هەوڵێک بۆ ڕەخنەگرتن لە هەموو سروشەکان" بوو، بڵاوبکاتەوە. فیختە، کە تا ئەم کاتە هیچ شتێکی بڵاونەکردبۆوە، دەبینی کتێبەکەی (لە ڕاستیدا ناوی خۆی لەسەر نەنووسیبوو!) وەک کێبێکی نوێی چاوەڕوانکراوی کانت تەماشادەکرا (بێگومان بەچاپ گەیاندنی کتێبەکە بەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەمەکی کانت). ئەو کاتە ئیمانوێل کانت فەیلەسوفێکی بەناوبانگبوو، هەر لەبەر ئەم هۆیەش پێشوازیەکی گەورەی لێکراو کتێبەکەی دەنگێکی مەزنی دایەوە. دواتر کاتێک کانت، کە نەک تەنها میهرەبان و دڵسۆزبوو بەڵکو خانەدانیش بوو، نهێنی کتێبەکەی فیختەی خستەڕوو و ئەوجا فیختە بەتەواوەتی بەناوباگبوو. ئەم پیاوە، کە بەشێوەیەکی لابەلا هاتە ناو فەلسەفەوە، لە ماوەیەکی یەکجار کەمدا پلەوپایەی بەرزی بەدەستهێنا؛ لەپێشدا لە شاری جینادا بووە پرۆفیسۆر و دواتریش لە بەرلیندا. فیختە لەو جۆرە پیاوانەبوو کە خۆی بە کەم نەدەزانی، ئەم حاڵەتەشی بەتایبەتی لەو کاتەدا بۆ دەرکەوت کە بیروراکانی بوونە جێگەی سەرنجی خەڵکی. بەڵام لەگەڵ بڵاوبوونەوەی "گوتارێک بۆ نەتەوەی ئەڵمانی" دا توشی نائومێدیبوو، چونکە خەڵکی وەک بابەتێکی بێزارکەر دەیانبینی (*لە ساڵی 1808 دا فیختە "گوتارێکی بۆ نەتەوەی ئەڵمانی" خوێندەوە، لەوێدا ڕەخنەی لە نەبوونی یەکێتی خەڵکی گرت، دواتر لەباسەکەیدا تیشکی خستە سەر چۆنیەتی یەکگرتنەوەی نەتەوەی ئەڵمانی. هەر لەبەر ئەم خاڵە وەک یەکێک لە بنچینەدانەرەکانی ناشیونالیزمی ئەڵمانی دادەنرێت. و). بەشێوەیەکی گشتی فەلسەفەی فیختە فەلسەفەی ـ ئاگاییە، بنچینەکەشی تێکەڵەیەکی ئایدیالیزمی ئەڵمانیە. ئەم جێگایەکی بەرز دەبەخشێتە "خود" و پڕاوپڕ وەک خوڵقێنەرێک دەیبینێ کە نەک تەنها جڵەوی بیرکردنەوەکانی مێشکی مرۆڤی لەدەستدابێت، بەڵکو بە خوڵقێنەری ئەو پێشنیارانەی جیهانیشی دادەنێت کە دواتر لە ڕێگەی فیکرەوە دەکرێنە هەقیقەت. خود لە جۆرە دیدەیەکی ئاوها فیکرییەوە دەبێت بە پلەی یەکەم "خودێکی بێپایان ـ موتڵەق" بێت، بەڵام لەگەڵئەوەشدا خود شادمان نیە بەو بێپایانیە، چونکە دەبێت ڕێگا بە تاکە کەسێکی دیاریکراوی سەربەخۆبدات کە بێتە جیهانەوە. لەم حاڵەتەدا خود "تا ـ من"ێک "دێنێتە کایەوە". واتە؛ ئاگایی بێپایان لەدەرەوەی خۆیدا شتەکان دەخوڵقێنێت (بۆ وێنە سروشت، یان تاکە کەسێکی دیاریکراو، یان "من"ێکی ئیمپیریست). ئەم پرۆسیسی هەقیقەتە، کە لێرەدا دەخرێتەڕوو، بە شێوەیەکی ئاشکرا دەگەڕێتەوە سەر یەکەمین خاڵی دەستپێکردن. ئەو خودە بێپایانەی کە دەئاخنرێتە ناو شتەکانەوە، ناو سروشتەوە، ناو سەرئەنجامی ئاگایی

جیهانەوە، لەکۆتایدا دەچێتەوە سەر هەڵسەنگاندنی ("هۆش"ی) خود خۆی. لەم خاڵەشەوە چیتر باس لە بێپایانی پەتی ناکرێت، بەڵکو بێپایانیەکی "دیاریکراو" دێتەکایەوە کە بەدەستی خۆی هەقیقەت تاقیدەکاتەوە و شێوەی خۆی دەنەخشێنێ. فیختە بنچینەی بیرکردنەوە فەلسەفیەکانی، کە خۆی پێیدەگوت "تیۆری زانستی" (لەبەرئەوەی دەبوایە بنچینەیەک بۆ هەموو زانستەکان دارێژێت)، بەچەندین شێوەی جیاواز جیاواز دەردەبڕی. هەموو کەرەتێک کە بابەتێکی نوێی دەهێنایە کایەوە، تیۆری زانستییەکەی زیاتر و زیاتر ڕووی لە ئەبستراک دەکرد و زیاتریش لە زەوی دووردەکەوتەوە، بەڵام ئەمە لەهەمان کاتیشدا فرەمانایی بیروڕاکانی دەردەخات. ئەو ناوی "سەردەمی زانستی ئەقڵ"ی لەو سەردەمە نابوو کە خۆی تێیدا دەژیا. فیختە وەک فەیلەسوفێکی "کرداری" لە سەردەمی زانستی ئەقڵییەکەیدا، دەیویست "وڵاتێکی داخراوی بازرگانی" دابمەزرێنێت. لە ناو "وڵاتێکی داخراو"ی بەم جۆرەدا، پێدەچێت دادپەروەرییەکی مەزنتر (مافی خوێندن بۆ هەمووان و هتد..) و جۆرە غەمگینییەکی گەورەتر سەرهەڵبدات. ئەگەر ئەمە ڕوویبدایە، ئەوا کۆمەڵگایەکمان دەبوو کە زیاتر لەوە دەچێت لە هۆڵێکی داخراودا دانرابێت، چواردەورەکەشی بە پاسەوان گیرابێت و لەسەر دەرگای چوونە ژوورەوەکەی نووسرابێت "کۆمەڵگایەکی داخراو ."

(بەپێی فیختەی فەیلەسوف، ڕەچەڵەکی سروشت لە چالاکی فیکرەیەکی باڵای نائاگاوە هاتووە... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 377)

**فیسینۆ، مارسیلیۆ Ficino، Marsilio**

کوڕە دکتۆربوو، دواتر خۆشی وەک باوکی بووە پزیشک و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ سەرچاوەی ژیانیبوو. بەڵام لەهەمان کاتیشدا سەرسامی فەلسەفە بوو، بەتایبەتیش لە ئەندێشەکانی پلاتۆن و پلۆتینی قوتابیدا هێزێکی ڕێکخەری خوڵقێنەری دەبینی کە لە لایەکەوە دەیویست لە ڕێگەی پەتێکی ڕۆحییەوە خودا و مرۆڤ پێکەوە گرێبدات و لە لایەکی تریشەوە دەیخواست ئاین و کەلتورە جیاوازەکان بەیەکەوە ببەستێتەوە. فیسینۆ "1433 تا 1499" لە ئەکادیمی بۆلۆگنادا وانەی دەگوتەوە، دواتریش لە ساڵی 1473 بەهۆی توانای تێڕامانی قووڵیەوە بووبە قەشە. فیسینۆ یەکەمین کەسبوو کە تەواوی نووسینەکانی پلاتۆنی وەرگێڕایە سەر لاتینی، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بەناوبانگ بێت و وەک کەسێکی شارەزا و لێکۆڵەرەوە ناسرا. هەرووەک چۆن پلاتۆن بە گرنگییەوە دەیڕوانیە ئیرۆس، فیسینۆش هەمان ڕۆڵی گرنگی بە خۆشەویستی دەبەخشی، ئەو دەیگوت؛ تکایە با خۆشەویستی لە ناو وردەکاریە هەستیەکانی ژیانی ڕۆژانەدا لەتوپەت نەبێت، چونکە خۆشەویستی ڕۆح تەواودەکات و پێکەوە دەچنە لای فریشتەکانی ئاسمان ـ لەوێدا کە چیتر هەموو ئەو شتانەی بە جەستەوە پەیوەستن جارستت ناکەن... لەوێدا کە تێڕامانی ئارامی خواییانە ژیانێکی هەتاهەتایی و ئاسوودە دەبەخشێت.

(یەکێک لە کەسایەتیە گەورەکانی ڕێنیسانس ناوی فیسینۆ بوو... جیهانی سۆفیا لاپەڕە 213*، 228)

### Exsitentialism فەلسەفەی بوونگەریی (ئێگزیستێنشیالیزم ـ وجودی)

هەر خودی زاراوەکە ناواخنی ئەم فەلسەفەیەمان بۆ ئاشکرادەکات؛ زۆرجار ئەم هەقیقەتە پڕ لە مەتەڵە هەتاهەتاییە کە پەیوەستە بە بوونی مرۆڤەوە دەبێتە یەکەمین هۆی فەلسەفە هەڵڕشتن ـ وەک ئاشکرایە مرۆڤ دوای مەبەستی تایبەتی خۆی دەکەوێت (تا ڕادەیەک دەتوانین بڵێن بەداخەوە هەر بەو شێوەیەش دەمێنێتەوە) وە ئەمەش دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی هەستێکی تایبەتی سەیر کە هەمیشە سەرهەڵدەداتەوە. فەلسەفەی بوونگەری لە جیهانی تایبەتی تاکە کەسەوە نزیکە (واتە ئەو شێوە تایبەتیەی کە تاکە کەسێک لە کاتی ئێستاکەدا بوونی خۆی پێ نیشاندەدات)، لەبەرئەوە ناتوانێت لە بازنەیەکی فراوانتردا (*جگەلە تاکە کەس خۆی) چالاک بێت. تاکە کەس سەرقاڵی چالاکیە تەسکەکانی تایبەت بەخۆی دەبێت و لێرەشەوە تاڕادەیەک وەک ئەوە وایە کە لە بازنەیەکی ناخۆشدا بجوڵێتەوە. دەتوانین بڵێین لە بنەڕەتدا کیاگەگۆ بابە گەورەی فەلسەفەی بوونگەرییە، بەڵام دەبێت ئاوگوستینی بابەی کڵێسەشمان لەیادبێت بەتایبەتی کاتێک دێتەسەر شیکردنەوەی کات، ئەمەش کەرەسەیەکی گرنگە و دەبێت لەلای هەموو فەیلەسوفێکی بوونگەری باش دەستبکەوێت. لە سەدەی بیستەمیشدا بە پلەی یەکەم جان پۆڵ سارتەری فەیلەسوف و نووسەر دێتە پێشچاومان، ئەم بوو کە دیسانەوە فەلسەفەی بوونگەری تا ڕادەیەکی دیار گەشاندەوە. فەلسەفەی بوونگەری لەلای ئەم زیاتر وەک دیاردەیەکی سەردەم خۆی نیشندەدات وەک لەوەی سەرەتایەکی نۆێی پڕ لە هیوای بابەتی بیرکردنەوە بێت.

(لە سەدەی بیستەمدا "فەلسەفەی بوونگەری (ئێگزیستێنشیالیزم)سەریهەڵدا، کە سروشی لە کیاگەگۆی دانیمارکیەوە وەرگرت... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 410*، 487)

### فەلسەفەی ژینگە

فەلسەفەی ژینگە یان "ژینگەسۆفی" گرێدراوی بزوتنەوەی ئیکۆلۆژیە، (*ئیکۆلۆژی؛ زانستێکە لە پەیوەندی نێوان زیندەوەر و هەلومەرجە سروشتیەکانی چواردەوری دەکۆڵێتەوە.و) چونکە ئەم فەلسەفەیە لەسەر بنەمای گرفتە دژوار و سەختەکانی ژینگەوە دەستپێدەکات. بەو شێوەیەش فەلسەفەی ژینگە زیاتر گرنگی بە وروژاندنی پرسیارە ئاکاریەکان دەبەخشێت و کەمتر بایەخ بە پلان و بیرۆکە پاشەڕۆژیەکان دەدات. فەلسەفە بە درێژایی مێژوو هەمیشە سەرنجی خستۆتە سەر پەیوەندی نێوان سروشت و ئەندێشە، مرۆڤ و چواردەورەکەی، بەڵام تیشکی نەخستۆتە سەر قەیرانە ئیکۆلۆژیەکان و دەبێت ئەمڕۆکە ئێمە بیانخەینە بەرچاو. بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا چەند فەیلەسوفێکمان لە مێژوودا هەبووە کە ئاگاداری ئەم بابەتەیان کردووین و ئامۆژگاری خۆیان لەم بارەیەوە خستۆتەڕوو. یەکێک لەوانە (مایەی سەرسوڕمانە) هایدیگەری فەیلەسوف بوو، ئەو لەکاتی خۆیدا ئاماژەی بۆ "لەیادکردنی بوون" و سەرهەڵدانی "بیرکردنەوەی لاواز و هەژاری" مرۆڤایەتی دەکرد و دەیگوت؛ مێشکی مرۆڤ سست و تەمبەڵ بووە و ئێستاکە تەنها مەستی سەرکەوتنە رووکەشیەکانیەتی (کە لەسەر بنەمای "بیرکردنەوەیەکی ژمارەیی (حسابی)" پەتی هەڵچنراوە) لێرەشەوە خۆیان لەیاددەکەن و بەئاگانین لەوەی کە چیتر ناتوانن لە بازنەی ئەو فیکرەیەدا بێنە دەرەوە کە پێشتر خۆیان هەوڵیان بۆ

دەدا؛ "بیرورای تەکنیکی جیهانی هێدی هێدی کەم دەبێتەوە و وون دەبێت... بەتایبەتیش لە کاتێکدا کە مەترسیەکی مەزنتر هەڕەشەمان لێ دەکات _کتومت لەم کاتەدا کە هەڕەشەی شەڕی جیهانی سێهەم بە ئاشکرا دیارە. ئەمە جۆرە بیرکردنەوەیەکی سەیرە، بەلاّم تەنها ئەو کاتە دەبێتە ئاسایی کە بە قووڵی بڕوانین..." ئەمە مەترسیەکی زاڵە، "چونکە شۆڕشی تەکنیکی بەشێوەیەک لە شێوەکان تاڕادەیەکی دیاریکراو مرۆڤ بەیەکەوە دەبەستێتەوە، فریویان دەدات، نابینایان دەکات، بەو شێوەیەش ڕۆژێک دادێت کە مرۆڤ تەنها پشت بە بیرکردنەوەی ماتماتیکی و ژمارەیی ببەستن و هیچی تر... لێرەشەوە ئەندێشەی قووڵ و زیرەکانە لەگەڵ نەخشەی تەکنیکیدا دەتوێتەوە، بەو شێوەیەش سەرکەوتن و بیرتیژی مەزنی تەکنیکی لە ناو جۆرە "تافیکریەکی" تەواوەتیدا وونەبێت.. ئەوجا چی؟ ئەو کاتە مرۆڤ نکۆڵی لە گرنگترین خاڵ و بێوێنەترین لایەنی خۆی دەکات؛ کتومت ئەو ڕاستیەی کە مرۆڤ بوونەوەرێکی بە ئەندێشەیە. خاڵە گرنگەکە لێرەدایە؛ دەبێت بوونی مرۆڤ بپارێزرێت، ئەمەش تەنها ئەو کاتە ڕوودەدات کە ئەندێشەی مرۆڤ بەشێوەیەکی بەخەبەر بهێڵینەوە."

(ڕێبازێکی گرنگی فەلسەفەی سەدەی بیستەم، "فەلسەفەی ژینگە" یان "ژینگەسۆفی" بوو... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 496)

**فەلسەفەی شیکارگەری**

لە فەلسەفەی شیکارگەریدا، کە چەندەها بزوتنەوەی فەلسەفی جیاواز جیاوازی سەدەی بیست دەگرێتەوە، لایەنی ڕیالیستی ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت. لێرەوە ماڵئاوایی لە پێکهاتەی سیستمی میتافیزیقی سەدەی نۆزدە کرا و لەبری ئەوە بایەخ بەو شتانە درا کە بەدروستی دەگوترێن و دەکرێن. لە ڕێگەی ئەم فەلسەفەیەوە لایەنی بەکارهێنانی ڕاست و ڕەوانی وتە و زاراوەکان هەڵدەسەنگێنرێت و لە بواری بەکارهێنانی ڕاستەقینەی وتەکان دەکۆڵدرێتەوە (بێگومان ئەمەش هەمووکات شتێکی ئاسان و دیار نیە). لێرەدا مەبەست لەوەیە کە فەلسەفە تا ڕادەیەک سەرنج دەخاتە سەر بابەتە بچکۆلەکان؛ واتە چیتر لەگەڵ دیدە و تێڕوانینی گەورە گەورەدا مامەڵە ناکات و لەبری وان بایەخ بە پێناسەی دیاریکراو و پتەو دەدات، وە لە ڕێگەی شیکردنەوەی وردی زمانەوە (بەتایبەتیش زمانی ئاسایی) هەوڵدەدات بەهای پێناسەو وتەکان دەربخات و لێرەشەوە سوودبەخشی و بێسوودیان دەخاتەڕوو. ئەم جۆرە تێڕوانینە، کە دەگەڕێتەوە بۆ فەیلەسوفی نەمساوی لودفیش فیتخیشتاین (1889 بۆ 1951)، دواتر یەکجار بڵاوبووە و لە چەندین بارەوە گەشەی پێدرا؛ لەلایەکی دیشەوە هەندێ هەوڵی تریشمان لەم بوارەدا هەیە کە زیاتر دەچنە پاڵ لۆژیکی فۆرماڵەوە. ئەم جۆرە هەوڵانە، کە پڕن لە وردەکاری، گەر لەگەڵ فەلسەفی ئاسایی پێشتردا (کە تەنها دەیانخواست بیروڕاکان دابڕێژن) بەراوردیانبکەین، بەتەواوەتی سەرنجراکێش دێنە پێشچاو.

(بزوتنەوەیەکی تر کە پێی دەگوترێت "فەلسەفەی شیکارگەری" یان ئیمپیریزمە لۆژیکیەکان کە ڕەگەکەیان دەگەڕێتەوە سەر هیوم و ئیمپیریزمە بەریتانیەکان... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 495)

### ڤۆڵتێر Voltaire

لە ڕاستیدا ناوی "فرانکیۆس ماریی ئاریۆت" بوو، بەڵام ناوی خۆی نابوو ڤۆڵتێر. ئەم هەم نووسەر و هەم فەیلەسوفیش بوو وە لەسەرو ئەوەشەوە خاوەنی شارەزایی و ئەزموونێکی گەوەری ژیان بوو. ڤۆڵتێر لەڕێگەی نووسینەکانیەوە سەروەتێکی گەورەی پێکهێنا، وە لەڕێگەی فەلسەفەکەشیەوە خەڵکانی بەدەسەڵاتی هەراساندەکرد، ئەزموونی مەزنی ژیانیشی هەمیشە دەرفەتی هەڵڕشتنی چەند گوتارێکی باشی دەدا. لەسەرو ئەمانەشەوە ڤۆڵتێر "1694 تا 1778" نوکتەچیەکی بەناوبانگبوو، هەرچەندە ئەم توانایەی نەک تەنها کەسانی چواردەورەکەی بەڵکو هاوەڵە نووسەرەکانیشی بەدڵیان نەبوو؛ بۆ نمونە لە پاش خوێندنەوەی کتێبەکەی ڕووسوی فەیلەسوف "سەبارەت بە نایەکسانی لە نێوان مرۆڤدا" هەستی ئەم فەیلەسوفەی بەم شێوەیە بریناركرد (بێگومان وتەی " گەڕانەوە بۆ سروشت" ڕووسوی بەناوبانگکرد)؛ "هەتا ئێستاکە هیچ کەسێک هێندەی بەڕێزتان ئەوەندە ووزەی مێشکی بەکارنەهێناوە بۆ ئەوەی سەرلەنوێ بمانکاتەوە بە ئاژەڵ. ئەو کەسەی کتێبەکەتان دەخوێنێتەوە، پڕ بەدڵ ئارەزووی گاگۆڵکێ دەکات. پێمخۆشە هێندە بڵێم کە من بەش بە حاڵی خۆم شەست ساڵێک دەبێت دەستم لەو خووە هەڵگرتووە، هەر لەبەر ئەم هۆیەش بە هیچ جۆرێک ناتوانم سەرلەنوێ دەست پێبکەمەوە."...

ڤۆڵتێر کەسێک بوو لەوانەی کە پێیان خۆشە خۆیان دەرخەن و چێژی لەوە دەبینی بە دورودرێژی باسی نەخۆشیە (پێدەچێت هەڵبەستراو بووبێت) زۆرەکانی بکات؛ زۆرجاریش بە فیزەوە باسی "خوێندنە نیوە ناچڵەکەی" دەکرد و ناوی خۆی نابوو "فەیلەسوفێکی نەزان". ڤۆڵتێر جیهان بینینێکی گوماناوی هەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێیوابوو مرۆڤایەتی تارادەیەک بتوانێت پێشبکەوێت. لایبنیزی هاوەڵی لەو بڕوایەدابوو یەزدان باشترین و نایابترین جیهانی ئافەریدەکردبێت، ئەم تیۆریەش بەلای ڤۆڵتێرەوە پڕاوپڕ بێمانا و دوور لە ئەقڵبوو. وە لەبری ئەوە لەڕێگەی ئایرۆنیە بەناوبانگەکەی خۆیەوە داوا لە یەزدان دەکات یارمەتی بفەرموێت و مەبەستی خۆی ئاشکرابکات، هەر لەم بارەیەوە دەڵێت؛ "ئەم سیستمەی (کە لە هەموو لایەنێکەوە هەر باشییە)، خولقێنەری سروشت وەک پاشایەکی مەزن و دڵڕەق دەناسێنێت، پاشایەک کە بەلایەوە گرنگ نیە گەر چوار پێنج هەزار کەسێک بمرێت، بەلایەوە ئاساییە گەر مرۆڤ سەرتاپای ژیانی لە ناو فرمێسک و نەبوونیدا بەسەربەرێت... ئایا یەزدان تەنها لە یەک شوێندایە؟ یان بە هیچ جۆرێک لە هیچ شوێنێکەوە نزیک نییە؟ یان لە یەک کاتدا لە هەموو شوێنێکدایە؟ ئایا سروشتی خوا جەستەییە یان ڕۆحیە؟ من لە کوێوە وەڵامی ئەمانە بزانم... ئامۆژگاریەکی بەسوود دەڵێت "خۆت بناسە"، بەڵام تەنها خودا دەتوانێت ڕاست و دروست ئەمە بە هەقیقەت بگەیەنێت"...

(لێرەدا مەبەستمان لە ناوە گەورەکانی وەک مۆنتیسکۆ و ڤۆڵتێر و ڕووسو و چەندەها و چەندەهای تریشە... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 284، 334*)

### کانت، ئیمانوێل Kant، Immanuel

کانت "1724 تا 1804" فەیلەسوفێک بوو کە لە کات و شوێنی خۆیدا لەدایک بوو. ئەم فەلسەفەی وەک پیشەیەکی لاوەکی وەرنەگرتبوو، بەڵکو پیشەی سەرەکیبوو (لە شاری کۆنیگسبێرگدا پرۆفیسۆر بوو)، وە زیاتر وادێتە پێشچاو کە چاوەڕوانی نۆبەی خۆی

بوویێت؛ خۆی ئامادەکردبوو ("هەروەک خۆی دەیگوت؛ دەمەویێت کارەکانی خۆم دەستپێبکەم و هیچ شتێکیش ناتوانێت بموەستێنێت"). کانت هات و نایابترین بیرۆکەی سەردەمەکەی لە ناو فەلسەفەیەکی ڕەسەندا کۆکردەوە. لەڕاستیدا فەلسەفەکەی شتێکی نوێبوو، بەپلەی یەکەمیش مەعریفەیەکی باوەڕپێکراوی دەردەبڕی کە بە شێوەیەکی ڕوون و لە ئاستێکی بەرزدا بوو. هەموو ئەمانەشی لە ڕێگەی هەوڵ و کۆششێکی یەکجار گەورەوە بەئەنجام گەیاند. بێگومان کانت بیرمەندێک بوو کە کاری لەسەر هۆشیاریدەکرد و "بەرژەوەندی مرۆڤایەتی" لەبەرچاودابوو، بەڵام لەگەڵئەوەشدا وەک کەسێکی خاکی و بێفیز مایەوە، تەنها ئەوەندەبوو کە نەیدەویست "ڕۆڵ و سوودبەخشینی لە کارکەرێکی ئاسایی کەمتربێت."

کانت لە خێزانێکی پیشەکاری هەژاردا لەدایکبوو (یانزە منداڵیان هەبوو و ئەم ژمارە چواریان بوو). هەر لە تەمەنی لاویدا لەگەڵ گرفتەکانی بووندا تێکەڵبوو، وە بەهۆی بەهرەمەندی خۆی و کەمێک کۆمەکی دەرەکییەوە توانی لە تەمەنی شانزەساڵیدا لە زانکۆی کۆنیگسبێرگدا بخوێنێت؛ لەوێدا، جگە لە بابەتەکانی تر، ماتماتیک و سروشتناسی و تیۆلۆژی و فەلسەفەی خوێند. پارەی خوێندنەکەشی، هەروەک لەلایەنە ڕەسمییەکانەوە باسدەکرێت، لە ڕێگەی یاریکردنی بلیارد و زیرەکی خۆی و وانە وتنەوەوە پەیدادەکردووە. دوابەدوای مردنی باوکی ناچاربوو وەک مامۆستایەک لە ماڵاندا کاربکات. کانت لە ساڵی 1755 دا گەڕایەوە بۆ زانکۆ، نامەی ماجیستێرەکەی نووسی و ماوەیەکی کەم بەدوایدا نامەی دکتۆراکەشی تەواوکرد. بەلەش و لار پیاوێکی بچکۆلەبوو، بەڵام وەک بیرمەندێکی مەزن تەماشای دەکرا. کانت مرۆڤێکی ساکار بوو و نەیدەویست هێندە خۆی نیشانبدات. دواتر بۆماوەی چەند ساڵێک بەگوڕ کاریکرد؛ وەک مامۆستایەکی زانکۆی تایبەت و تاوناتاوێکیش فەرمانبەری کتێبخانەبوو، هەتاوەکو لە ساڵی 1770 دا لە زانکۆی کۆنیگسبێرگدا وەک پرۆفیسۆرێکی میتافیزیک و لۆژیک دامەزرا. لەو کاتەشەوە ئیتر نائارامییە ئابوریەکانی کۆتایی هات، ئیتر لەوەبەدواوە و "بەدرێژایی ژیانی" سەرنجی خستە سەر فەلسەفە کە وەک ئەرکێکی سەرەکی ژیانی دەیبینی.

کانت پرسیارە فەلسەفییە "هەتاهەتاییەکانی" ئاڕاستەی خۆیدەکرد، ئەو پرسیارانەش بە ڕواڵەت ئاسان دێنە بەرچاو، بەڵام لە ڕاستیدا هەتا ڕادەیەکی یەکجارزۆر دژوارن، وە ڕێک لەبەر ئەو دژوارییەیە کە بەردەوام دەفەلسەفێنرێن. لێرەدا تاڕادەیەک لەوە دەچێت باس لە جۆرە پەرۆشییەکی هۆشی و ڕۆحانی بکرێت، بەڵام پرسیارەکان لەم شێوەیەی خوارەوەن؛ "دەتوانم پەی بە چ شتێک بەرم؟"، "دەتوانم چی بکەم؟"، "چ شتێک شیاوی ئەوەیە ئومێدم بۆی هەبێت؟"، "مرۆڤ چییە؟" کانت بەر لەهەموو شتێک بنەمایەکی مەعریفی دڵنیای پێبەخشین؛ ئیمپیرزم و ڕاشیۆنالیزم ناتەبان لەسەر ئەوەی چ شتێک گرنگییەکی سەرەکیتری لە مەعریفەدا هەیە، ئایا ئاگاییە یان هەقیقەتە؟ کانت توانی بە شێوەیەکی زیرەکانە ئەو گرژیەی نێوان ئیمپیریزم و ڕاشیۆنالیزم شیبکاتەوە و ڕێکیانبخات. ئەو دەیگوت لە پرۆسەی مەعریفیدا لە ڕێگەی چەند بیروبۆچوونێک و تێگەیشتنێکی دیاریکراوەوە هەقیقەت دەبینین، هەر ئەو ئەندێشە و تێگەیشتنانەشە کە زانیاریە هەستییەکانمان پێدەبەخشن. ئەو فۆڕمە سەرو سروشتییانە (بۆ نمونە کات و شوێن، هۆ و ئەنجام) لە شتێک پێکهاتوون کە بەدەر لە هەستەکانمان بوونیان هەیە و لێرەشەوە "گشتی و پێویستیشن"، بەڵام هەر ئەو فۆڕمانەیە کە دەبنە هۆی ئەوەی شتەکان ببینین و لێرەشەوە دێنە مەعریفەمانەوە. واتە کاتێک پەی بە شتێک دەبەین، لەڕاستیدا

شێوە نەخشێکی دیاریکراوی بەسەردا دەپۆشین، هەر لەبەرئەمەشە کە شتەکان تەنها بەو جۆرە دەردەکەون کە ئێمە دەیانبینین و لێیان تێدەگەین. وەک ئەوە وایە کە شتەکان لە رێگەی جۆرە چاویلکەیەکەوە ببینین کە بەدەر لە پێکهاتەی سەرو سروشتییەکەیان، شێوەی بنەڕەتی مێژوویشیان بخاتەڕوو. لێرەشەوە تەنها تا ڕادەیەک ڕێیتێدەچێت کە لە مەعریفەی ڕاستەقینەی بابەتی تێبگەین؛ هەرچی سەبارەت بە "شتەکان وەک ئەوەی کە هەن" ڕێیتێناچێت، بەڵام کاتێک زانست مامەڵە لەگەڵ جۆرە پرۆسەیەکی شارەزابووندا دەکات کە لەسەر بنەمای جیهانبینینێکی هاوبەشی مرۆیی دامەزراوە، تەنها ئەو کاتە ڕێیتێدەچێت مەعریفەیەکی بابەتی ببینین. ئەم مۆدێلی مەعریفەیەی کانت لەوە دەچێت جێگەی متمانەبێت، بەتایبەتیش لەبەرئەوەی بوارێک بۆ گریمانەیەک جێدێڵێت کە مرۆڤە پربیرەکان (درەنگ یان زوو) خۆیان پێیدەگەن؛ ئەویش ئەوەیە کە هەقیقەتێک هەیە کە بوونی پەیوەست نییە بە ئێمەوە، بەڵام ئێمە هەتاوەکو بتوانین وێنەیەکی ئەو هەقیقەتە بۆ خۆمان دەنەخشێنین، وێنەیەک کە بتوانین لەگەڵیدا بژین و مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، بەڵکو لەسەرو ئەوەشەوە دەکرێت جار نا جارێک بەهۆی ئەو وێنەیەوە پێشکەوتنیش بەدەست بهێنین. هەموو شتێک کە لە سەرو ئاسۆی مەعریفەی ڕاستەقینەی مرۆیی تێپەڕدەبێت، تەنها دەبێتە بیرکردنەوە و هیچی تر، هەر لەبەر ئەم هۆیەش نەدەبن بە بیرکردنەوەیەکی سوودبەخش وە نە بە ئەندێشەیەکی بێماناش. خوا و ڕۆح و جیهان جۆرە "بیرۆکەیەکی بەیاساو دەستورن" و خاڵێکی گرنگ و هەمیشەیی نیشاندانی زانستمان پێکدێنن.

"دەتوانم چی بکەم؟"، کانت بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە و دەڵێت؛ دەبێت هزرێکمان هەبێت کە تەنها خۆمان نەبینێت، بەڵکو بەجۆرێک هەڵسوکەوتمان پێبکات کە سوودی بۆ خۆشگوزەرانی گشتیش هەبێت. باڵاترین یاسای ئەقڵانی و شێوەی هەڵسوکەوتی ئاکاری، ئەو یاسایەیە کە ناوی نابوو "فەرمانی بێ چەندوچون" و دواتر یەکجار ناوبانگی دەرکرد. لە هەندێ ووردەکاری ئەم یاسایەدا دەڵێت؛ "دەبێت هەمیشە بە شێوەیەک هەڵسوکەوت بکەیت، کە لە هەمان کاتدا وابخوازیت ئەو یاسایەی کە هەڵسوکەوتی پێ دەکەیت، ببێتە یاسایەکی گشتی. دەبێت بە شێوەیەک ڕەفتاربکەیت، وەک ئەوەبێت کە لە ڕێگەی ویستتەوە بنەمای یاسای ڕەفتارەکەت ببێتە یاسایەکی سروشتی. دەبێت هەمیشە وەک ئامانجێک هەڵسوکەوت لەگەڵ خۆت و خەڵکانی تردا بکەیت، نەک وەک پێبەردێک بۆ ئەوەی شتێکی تر بەدەست بهێنیت". کردەوەی باشە و خراپەی دیاریکراویش بەجێدەهێڵرێت بۆ تاکە کەس و دەبێت بە "ئەرکی سەرشانی" بزانێت و خۆی بڕیاربدات. فەرمانە بێ چەندوچونەکەی کانت تەنها یاسایەکی گشتی دەخاتە بەرچاو وە ڕەفتارە جیاوازەکانی تاکە کەسیش دەبێت پەیڕەوییبکات. کانت هیچ جۆرە بەهانەیەک قبوڵ ناکات کە بڵێت لە ناچاریدایە کە تەنها بە شێوەیەکی دیاریکراو دەتوانم ڕەفتاربکەم (بێگومان مرۆڤ لە ژێر کاریگەری کۆمەڵێک یاسادایە و هەقیقەتیان بۆ داڕشتووە)، لەم بارەیەوە کانت دەڵێت؛ ئێمە سەربەستین، چونکە بوونەوەرێکی ئەقڵانین. ئێمە دەتوانین خۆمان لە سەرو شتەکانەوە ببینینەوە و بەسەر زۆرەملێیدا زاڵبین، ئەمەش شتێکە کە ویژدانیشمان پێمان دەڵێت؛ "دەتوانیت، چونکە ناچاریت ."!

پرسیارێکی دی کە دەڵێت؛ چ شتێک شیاوی ئەوەیە ئومێدم بۆی هەبێت؟ کانت ئەم پرسیارە ڕووبەڕووی ئاین دەکاتەوە و لێرەدا وای بەباش دەزانێت جۆرە نەفەس درێژییەک نیشانبدرێت؛ "تەنها یەک ئاینی (ڕاست و دروست) بوونی هەیە، بەڵام پێدەچێت چەندەها شێوەی بڕواکردنمان پێی هەبێت". لەلایەکی تریشەوە دەبێت ئاین "بە شێوەیەکی نا ئاقڵانە" لەگەڵ هزردا نەکەوێتە شەڕەوە، چونکە "بەرگەی ناگرێت". واتە لە بنەڕەتدا کانت باسی ئاینێکی ئەقڵانی تایبەت بە تاکەکەسێکی دیاریکراو دەکات. ئاینێک کە بە بەراوردکردنی لەگەڵ بڕوای ئاینی مەسیحیدا، تاڕادەیەک کراوەترە بەرامبەر شتە جوانەکان و نایابەکان و گەورەکان. بۆ ئەوەی هیوا و دڵنەوایی لەو ئاینەدا بدۆزینەوە، پێویستمان بە پەیڕەویکردنی کۆمەڵێ ئەندێشەی قوڵ و گەورە نییە؛ بەڵکو بەپێچەوانەوە، تەنها بۆنەیەکی بچکۆلەمان پێویستە؛ "لە شەوێکی هێمنی هاویندا، کە پرشنگی ئەستێرەکان تاریکیی شەو دەشکێنن و مانگی تاقانەش لە ئاسۆوە خۆی نیشاندەدات" وە ئەو کاتە "هێدی هێدی هەستە بەرزەکان سەرهەڵدەدەن؛ هاوڕێیەتی، نەمری ، بایەخنەدان بە دونیای مادی"

مرۆڤ چییە؟ کانت لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەچێتە سەر ئەنترۆپۆلۆژیا. ئەو هەتا بکرایە نەیدەویست لە سنووری داواکاری هزر تێپەڕێت، کە بەپێی ئەو دەبوایە هەموو لایەنە مرۆییەکانیش بگرێتەوە. لەلایەکی تریشەوە کانتی میهرەبان لە ڕاستیدا جار ناجارێک کەمێک لایەنی خراپەکاریشی هەڵدەڕشت، بۆ نمونە دەڵێت؛ "دەتوانین بڵێین کەللەی مرۆڤ لە بنەڕەتدا لە تەپڵێکی بەتاڵ دەچێت و تەنها دەنگی لێوە دێت"، بەڵام هەر ئەم مرۆڤە گەورەیە، کەمێک دواتر دەڵێت؛ "پێویست ناکات ببینە مایەی دەردەسەری و کۆسپ بۆ یەکتری، چونکە جیهان هێندە گەورەیە کە جێگەی هەموومانی تێدا دەبێتەوە."

(لەدوای هیومەوە، کانتی ئەڵمانی دووهەمین ڕێبازی گەورەی فەلسەفی بوو. جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 250، 284، 330، 333*، 342، 363، 368، 386، 388،390، 410)

### کریستینای سویدی، شاژن Christina Of Sweden

کریستینای کچی "گۆستاف ئادۆلف"ی پاشای سویدی پێی خۆشبوو لەگەڵ پیاواندا تێکەڵاو ببێت، بەتایبەتیش پیاوانی زانست و هونەرمەندە بەناوبانگەکان. کریستینا "1632 تا 1654" دیکارتی فەیلەسوفی بەناوبانگی بانگکردە کۆشکەکەیەوە و وەک بیرمەندێک و ڕاوێژکارێک دایمەزراند، بێگومان ئەم کارەشی جێگایەکی چکۆلەی لە فەلسەفەدا پێبەخشی. دیکارت پێی خۆشبوو بەیانیان درەنگانێک لە خەو هەستێت و دەیخواست تا دەمەونیوەڕۆ لە جێگادا بمێنێتەوە، بەڵام کریستینا ناچاریکرد بەیانیان زوو هەستێت، ئەمەش لەلایەکەوە بەردەوام مەزاجێکی ناخۆشی بە دیکارت (ئەو کاتە تەمەنی 54 ساڵ بوو) دەبەخشی وە لەلایەکی تریشەوە کەشی تەڕوساردی سوید تووشی هەڵامەتێکی سەختیکرد، دواتر لێی پیسکرد و تووشی نەخۆشی هەڵئاوسانی سی کرد، پاشانیش هەر ئەو نەخۆشیە کوشتی. کریستینا تاڕادەیەک حەزی لە گاڵتە و تانە و تەشەربوو، وە دەڵێن لە پاش مردنی دیکارت گوتوویەتی؛ "مامۆستا بەناوبانگەکەم پەیمانی دامێ و گوتی بەهاریکاری زانست دەتوانم سەد ساڵ بژیم، کەچی پەیمانەکەی نەبردە سەر."

(لە ساڵی 1649 دا لە لایەن کریستینای شاژنی سویدەوە بانگکرا... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 250)

## Copernicus، Nicolaus کۆپەرنیکۆس، نیکۆلاس

ئەو زاراوەیەی کە پێیدەگوترێت "وەرچەرخانی کۆپرینکی" لە ناوی ئەمەوە هاتووە. کۆپەرنیکۆس ژیانێکی هێمنی بەسەربرد، لە خێزانێکی دەوڵەمەنددا لەدایک بوو و ڕووبەڕووی هیچ جۆرە گرفتێکی مادیی نەبووەوە، هەر لەبەر ئەم هۆیەش بەبێ هیچ کۆسپ و تەگەرەیەک توانی بەتەواوەتی سەرقاڵی خوێندنەکەی بێت؛ لە ڕاستیدا خوێندنەکەی فرەلایەن بوو؛ کۆپەرنیکۆس "1473 تا 1543" ماتماتیک و فیزیا و ئەستێرەناسی و پزیشکی و زمانە کلاسیکەکانی دەخوێند، دواتریش پلەی دکتۆرایان لە یاسای کڵێسەی کاتۆلیکیدا پێبەخشی. لە سەرەتادا ئەندێشە قووڵەکانی هێندە بەلای خۆیەوە سەیر بوو کە بەتەواوەتی دوودڵبوو لە بڵاوکردنەوەیان. نەیدەویست "خۆی بکاتە مایەی پێکەنین"، مرۆڤێکی وریا بوو و نەیدەخواست هەروا بە ئاسانی لەگەڵ کڵێسەدا ناتەبابێت، بەڵام لەگەڵئەوەشدا زوتر لەکاتی خۆی بڕیارە گرنگەکەی دا و ئەندێشەی خۆی دارشت؛ "هەموو ئەستێرەکان بە شێوەیەکی بازنەیی بەدەوری خۆردا دەخولێنەوە، وە خۆریش لە ناوەڕاستی هەموو ئەستێرەکاندایە، لەبەرئەمەش خاڵی ناوەڕاستی گەردوون لە شوێنێکی نزیک بە خۆردایە". دواتریش ژیانێکی هێمنی هەڵبژارد، زیاتر لە ئەفسانە دەچوو؛ لە قەڵایەکدا دەژیا، لەوێدا بیریدەکردەوە، شتی دەینووسی و توێژینەوەی دەکرد، تەنها کەسێکیش کە ڕێگەی پێدەدا بچێت بۆ لای، ئافرەتێک بوو بە ناوی "ئانا شیللینگ"ەوە، ئەم کاروباری ناو ماڵی بۆ جێبەجێدەکرد، بەڵام بەپێی قسەوباسی ئەو سەردەمە پەیوەندی ئەم ئافرەتە بە کۆپەرنیکۆسەوە، تەنها لە چوارچێوەی ماڵبەڕێوەبردندا نەبووە.

(کۆپەرنیکۆس دەیگوت، خۆر بەچواردەوری زەویدا ناخولێتەوە، بەڵکو تەواو بە پێچەوانەوەیە... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 218*، 347)

## Condorcet، Nicolas کۆندۆرسێت، نیکۆلاس

کۆندۆرسێت "1743 تا 1794" هەم زانای ماتماتیک و هەم فەیلەسوفیش بوو. ئەم لە هەموو بابەتێکدا، کە شیاوی ئەنجامدانە، بڕوای بە ڕۆڵی مەزنی هزربوو. لێرەشەوە دەیگوت دەکرێت "جۆرە دەستورێکی سەربەست" شانبەشانی "پێکهاتەی گشتی هاوڵاتیان" دابمەزرێنرێت. بەڵام ئەمەیان سەخت بوو. فەیلەسوفەکانی پێش شۆڕشی فەڕەنسی بە توندی داوای مافی خەڵکیان دەکرد، ئەمەش خاڵێکی گرنگە و شایانی تێڕوانینە، وە کاتێکیش شۆڕشی فەڕەنسی سەرکەوتنی بەدەست هێنا، کەسە توندڕەوەکان هاتنە مەیدانەوە و بیرۆکە ڕۆشن و بنەڕەتیەکانی کۆندۆرسێتی ئەکادیمییان بەتەواوەتی هەڵگێڕایەوە. کۆندۆرسێت لەڕادەبەدەر زانستی بەلاوە مەبەستبوو و دواتریش بووە زانای ماتماتیک. هەموو بیرۆکە ڕامیاریە ڕۆشنکەر و چاوەترسەکانیشی لەسەر بنەمای

ماتماتیکەوە هەڵچنیبوو؛ وەک بنچینەیەک سوودی لە ستاتیستیک (ئاماری، ئەژماری) دەبینی و پشتی بە زمێرە شیمانەکان (ئیحتیمالیەکان) دەبەست. بۆ نمونە؛ داوای یەکسانی ئافرەتی دەکرد، یان دەیگوت زانست وەک ئەداتێکی ئەقڵانی باشە کە لە خزمەتی مرۆڤایەتیدا بێت، یان سەربەستی بۆ چەوساوەکان دەخواست و داوای مافی بۆ هەمووان دەکرد، ئەمانە هەموویان (تا ڕادەیەک) لە سەرو هەموو گومانێکەوە دەوەستن.

(لە ساڵی 1787 دا (*ژمارەی ساڵەکە لە لاپەڕەی 338 ی جیهانی سۆفیادا بە هەڵە نووسراوە 1789، تکایە بیگۆڕە بە 1787.و) "کۆندۆرسێت"ی فەیلەسوف وتارێکی دەربارەی مافی ئافرەتان بڵاوکردەوە... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 338)

**Kierkegaad، Søren کیاگەگۆ، سیۆرن**

هەتاوەکو سەردەمی کیاگەگۆ "1813 تا 1855" چەند سیستمێکی قورس باڵی بەسەر فەلسەفەدا کێشابوو، بەڵام لەگەڵ هاتنی ئەودا سروەیەکی پاک و نوێ هەڵیکردە ناو فەلسەفەوە. کیاگەگۆ لە ڕاستیدا زانایەکی تیۆلۆژبوو. لەو کاتەدا هەتاوەکو بیانتوانیبایە بنەمای لێکدانەوەی جیهانیان دەگەڕانەوە سەر پنتێکی کۆنتر و کۆنتر، بەڵام کیاگەگۆ بە پێچەوانەوەبوو؛ ئەو هات و لە گرفتە بوونییەکانی تاکە کەسەوە دەستییپێکرد، ئەمەش شتێک بوو کە تاڕادەیەکی زۆر لەلایەن فەلسەفەوە پشتگوێخرابوو. کیاگەگۆ قوتابی بوو کاتێک کە گرنگترین ڕووداوی فەلسەفی بەسەرداهات، خۆی ناوی نابوو "بومەلەرزە گەورەکە". هەتاوەکو ئێستاکەش پسپۆڕەکان ناتەبان لەسەر ناواخنی ئەو بومەلەرزە گەورەیە. پێدەچێت درکی بە گوناحێکی پەردەپۆشکراوی سەردەمی منداڵی کردبێت (لەوانەیە پەیوەندی بە گوناحێک یان یاساشکاندنێکی سێکسییەوە هەبێت، یان پەیوەندی بە نەفرینێکی خوداوە هەبێت، یان زۆر بە ئاسانی دەشێت مەبەست لە ڕەفتارێکی خراپی نادیاربێت). بەهەرحاڵ باوکی توشی گوناحێک بوو و کوڕەکەشی هەستیدەکرد کە بەشداری گوناحەکەیەتی. جگە لەمەش هەم باوکیشی و هەم خۆشی دوو مرۆڤی دڵتەنگ و غەمناکبوون، ئەم خاسیەتەش هەندێ جار دەبێتە هۆی جۆرە دیدەیەکی تا بڵێیت ڕوون، کیاگەگۆ ناوی ئەو دڵتەنگییەی نابوو "بێئومێدییەکی هێمن". ئەم بەدرێژایی ژیانی هەستی بە گوناح دەکرد؛ هەستی دەکرد کە ژیانی لە چەند هەڵەیەکی یەک لەدوای یەک پێکهاتووە. تیۆلۆژیش (لاهوت)، ئەو خوێندنەی کە پاش مردنی باوکی بەرێزەوە تەواویکرد، هیچ جۆرە کۆمەکێکی نەخستە بەردەمی. لێرەشەوە ناچاربوو وەک نووسەرێک و فەیلەسوفێک بێتە ناو ژیانێکی سەربەستەوە. کیاگەگۆ زۆربەی کاتی وەک کەسێکی گەڕۆک لە شەقامەکانی کۆبنهاگندا دەبردەسەر، پاش ماوەیەکی زۆر کەمیش وەک وێنەیەکی ناسراوی ناوشار دەرکەوت و خەڵکی پێی پێدەکەنین، بەڵام لەهەمان کاتدا کەس نەیدەوێرا ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی ببێتەوە، چونکە هەمووان دەیانزانی کە کیاگەگۆ زۆر بەتووندی وەڵامیان دەداتەوە و دەست وبرد نوکتەیان لەسەر دادەنێت. بۆ ماوەی دوو مانگ بەردەوام سەرقاڵی گرفتی نیشانەکردنەکەی بوو، چونکە لەو بڕوایەدابوو کە لە هەموو بارێکدا بتوانێت ژیانێکی ئاسایی بژی. کاتێکیش کە نیشانەکردنەکەی هەڵوەشاندەوە، تەنها کەس کە سەریسوڕما، کچەکەی دەستگیرانیبوو. دواى ئەمەش کیاگەگۆ هەستی بە سەربەستییەکی تەواو و بێئومێدییەکی تەواو دەکرد؛ دەستی

بەنووسین کرد. ناونیشانی سەرنجڕاکێشەری وەک "یان ئەمیان یان ئەویان"، "ترس و هەڵلەرزین"، "چەمکی دڵەڕاوکێ"ی بۆ نووسینەکانی هەڵدەبژارد، وە لە دووتوێی کتێبەکانیدا گومانەکانی ناوەوەی دەکردە بابەتێکی فەلسەفی. کیاگەگۆ دەیگوت مرۆڤ بەردەوام ڕووبەڕووی هەڵبژاردنێکی بنچینەیی دەبێتەوە، ئەو هەڵبژاردنەش پێویستی بە بڕوابوونی (یان دانپیانانی) مرۆڤە بە خۆی و بە ژیان و بە خودا، بەڵام لەگەڵئەوەشدا زۆرینەی خەڵکی بڕوابوونێکی ئاوها وازلێدێنن؛ چونکە بێ ئەقڵی و تەمبەڵییان ڕێگەیان پێنادات بڕیاری گرنگ و سەنگین بدەن. بەلای کیاگەگۆوە بوونی تاکە کەس گرێدراوی پەیوەندییەکی تایبەتی سەخت و پڕگرژییە؛ دەبێت تێبگەین و خۆمان وەک بوونەوەرێک ببینین کە شیاوی مردنین، ژیانمان کەمخایەنە و ئێمەش ملکەچی ئەو یاسایەین، بەڵام لە هەمان کاتدا ئێمە، لە ناوەندی ئەو کاتەی کە هەریەکەمان بە تایبەتی پێیبەخشراوە، بەرەو سەربەستی بانگکراوین (لە ژێر ئاسمانێکداین کە نیشانەی خوێن ساردی و گوێپێنەدانمان بۆ دەنێرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەوێدا خودا بوونی هەیە). کیاگەگۆ نەیدەخواست دەست لە خوا هەڵبگرێت، هەرچەندە لەلایەکی ترەوە دەکرێت نووسینەکانی وەک پێناسەیەکی فەلسەفەی بوونگەری (وجودی)ش بخوێندرێتەوە، لەوێشدا، کاتێک کە بە قووڵی دەچێتە ناو بابەتەکانەوە، بەبێ هیچ خوایەکی مەزن دەتوانێت پشت بە خۆی ببەستێت؛ ئەم خاڵە تەنانەت ناواخنی فەلسەفەکەشی دەگرێتەوە، کە پێی دەگوترێت قۆناغەکانی ژیان، لەوێدا لەوە دەچێت دواهەمین قۆناغ "قۆناغی ئاینیی"ەکەی باشترین قۆناغبێت کە کەمتر تێیدا پشت بە ئاسمان دەبەستێت. کیاگەگۆ لە دوو قۆناغەکەی تریدا )قۆناغی جوانناسی و قۆناغی ئەخلاقی)، بەتایبەتیش لە نێوان ئەو دوو قۆناغەدا، هەروەکو کەسێکی پڕ لە "ئایرۆنی" دەردەکەوێت. ئەو خۆی تا ڕادەیەکی زۆر لە بواری ئایرۆنیدا بەهرەمەند بوو، وە بە پێچەوانەی ئەو کەسانەوەی کە خۆی دەیگوت ئایرۆنییان هەیە بەڵام قسەی خۆش نازانن، هەتا بڵێیت قسە خۆشێکی سەرنجڕاکێشەربوو. لەوەدەچوو کە "بێئومێدییە هێمن"ەکەی (لە ڕاستیدا بەدیوەکەی تری دەگوترێت "دڵخۆشییەکی بێ ناو") بەهرەیەکی تریشی پێ بەخشیبێت و بتوانێت ڕەخنە لەو هەموو مەسخەرە و پۆزلێدان و بێمانایی دابونەریتی جیهانی مرۆڤ بگرێت. بێگومان ڕوویدەدا کە خۆشی بکاتە مایەی مەسخەرە، لە ڕاستیدا هەر زۆر بە شێوەیەکی تایبەت ئەمەی دەکرد؛ لە ساڵی 1843 دا، لەو کاتەدا کە لە بەرلین فەلسەفەی دەخوێند "لەترسا نەخۆشکەوت" و بەم شێوەیە وەسفی خۆی دەکرد؛ "من ئێستاکە بە شێوەیەک لە شێوەکان ساغم... بە یاریدەی گۆچان دەڕۆم... هەروەک گوتم بەڕاستی لاوازم، قاچەکانم دەلەرزن و ئەژنۆکانم دێشێن و هتد... ئەم وەسفکردنەم هێشتام هەر کەمە، لەبەرئەوە دەمەوێت گوتەیەکی باشترین ئەکتەر بەلامەوە، کاک گرۆبیکەر، بهێنمەوە کە زۆر شارەزایانە ڕستەیەک لەناو هەموو چوار ڕستەیەکدا دەهۆنێتەوە و دەڵێت؛ "دەکەوم و دەمرم" ـ یان بەڕاستی باشترە بڵێم "دەمرم و دەکەوم". کیاگەگۆ سەبارەت بە فەیلەسوفە سیستم دانەرە گەورەکانیش، لەپێش هەموویاندا هیگڵ کە بەدڵی نەبوو، دەڵێت؛ "زۆربەی سیستیم دانەرەکان، گەر بەراوردیان بکەین بە سیستیمەکان، لە کەسانێک دەچن کە قەڵایەکی قەشەنگ بنیاتبنێن و خۆشیان لە تەنیشتییەوە لە خانوە سەگێکدا بژین"...

(لەوانەیە سیۆرن کیاگەگۆ کاتێک لە ساڵی 1841 دا کە بۆ گوێگرتنی وانەکانی شیللینگ چوو بۆ بەرلین، لە تەنیشت کارڵ مارکسەوە دانیشتبێت... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 331، 360، 397، 418*، 486، 495)

## Kepler، Johannes کیپلەر، جۆهانس

کیپلەر "1571 تا 1630" لە شاری گرازدا، بەشێوەیەکی نائاسایی لە دوو بابەتی دوور لەیەکدا پرۆفیسۆربوو؛ ماتماتیک و مۆراڵ. کیپلەر بە درێژایی ژیانی مرۆڤێکی خاوەن ئیمانبوو، هەر لەبەرئەم هۆیەش بە پێچەوانەی گالیلی هاوکارییەوە، لەگەڵ کڵێسەدا تەبابوو. کیپلەر یەکەم کەس بوو کە یاساکانی جوڵانەوەی ئەستێرەکانی دۆزییەوە وە دواتریش بەناوی ئەوەوە ناونران. جگە لەمەش رۆڵێکی گرنگی لە گەشەپێدان و پێشخستنی دووربیندا بینی. هەرچی دەربارەی فەلسەفەکەشیەتی لە کتێبێکدا خستییەڕوو و ناونیشانێکی جوانی بۆ هەڵبژارد؛ "نهێنی دروستبوونی جیهان". ئەم پێی وایە کە پەیوەندییەکی هاوئاهەنگی گەردوونی لەگەڵ خودادا بوونی هەبێت، وە خودا بە وەستایەکی بنیاتنەری نەبینراو لەقەڵەمدەدات، بەڵام کاتێک بەتەواوەتی لە ئافەریدە پڕنهێنی و فرەلایەنەکەی نزیکدەبینەوە، ئەو کاتە رێیتێدەچێت هەست بە شێوە نزیکییەکی یەزدان بکەین.

(بەڵام لە سەرەتای سەدەی هەقدەدا جۆهانس کیپلەر، کە ئەستێرەناسێکی ئەڵمانی بوو، ئەنجامی چاودێریکردنە دوور و درێژەکەی خستەڕوو... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 219*، 223)

## Galilei، Galileo گالیلی، گالیلۆ

گالیلی (1564 تا 1642) زانای فیزیا و ماتماتیک و ئەستێرەناس، ئیمپیریزمی هێنایە ناو چالاکیە زانستییەکانەوە، کە تا ئەو کاتەش ـ تەنانەت لە بواری بایۆلۆجیشدا ـ لەلایەن دۆگماتیزمەوە (بەپلەی یەکەمیش دەسەڵاتی کڵێسە) کاریگەرییەکی گەورەی لەسەربوو. هەرچەندە گالیلی لە شارەکانی پیزا و پادوا و فیرانسدا پرۆفیسۆربوو، بەڵام لەگەڵئەوەشدا بەردەوام گرفتی ئابووری هەبوو. دواتر گالیلۆ هاتە سەر بڕوای کۆپەرنیکۆس کە دەیگوت خۆر چەقی گەردوونە و لێرەشەوە ئازایانە وێرای دژ بە بڕوای باوی کڵێسە بێتەوە کە دەیگوت زەوی چەقی گەردوونە. پیاوانی کڵێسەش خێرا دژی وەستان و بەدادگایان گەیاند. پاشان ناچاریانکرد بە شێوەیەکی ڕەسمی بیروباوەڕەکەی ڕابکێشێتەوە و وەک سزایەکیش زیندانیانکرد. تا ڕادەیەک سزایەکی کەمیاندا، بەڵام دۆڕاندنێکی گەورەبوو و لەڕاستیدا دواتر ئاکامەکانی دەرکەوت؛ گالیلۆ گومانێکی کوشندەی لەخۆی بوو، بەتایبەتیش گومانی لە بەهێزی خۆی دەکرد لە کاتی دادگاکەیدا. لە پاش دادگاکەی دەبوایە کۆتایی بەو گرفتە بهاتایە، بەڵام لەگەڵئەوەشدا سووربوو لە سەر ئەو میتۆدەی کە گەشەی پێدابوو؛ جەختی لەسەر پێویستی زانیارییەکی ئیمپیریستی دەکرد کە بە هاوبەشی تیۆرییەکی ڕێکوپێک (وە ئەزموونێکی فیکری کە شیاوی دووبارەبوونەوەبێت) توانای گەشەدانی تێدا بێت، بۆ ئەوەی لێرەشەوە پێشکەوتنێکی بابەتی لە بواری زانستییدا بەدەست بهێنرێت. گالیلی دەیخواست وەسفی جیهان بەو شێوەیەبکات کە هەیە ـ واتە لە کاتی وەسفی زانستە سروشتییەکاندا ناچاربوو زیاتر

سەرنج بداتە بەها سەرەکی و بنچینەییەکان (واتە ئەو شتانەی کە دەپێورێن) وە هەموو لایەنە دووهەمییەکان (واتە ووردەکارییە نابابەتیەکان) پشتگوێبخات. گالیلی وەک ئەستێرەناسێک مانگەکانی مشتەری دەرخست (کە دواتر خۆشبەختانە بەناوی ئەوەوە ناونران) وە وەک زانایەکی فیزیاویش بنچینەی تیۆری جوڵەی تەنەکانی دۆزییەوە.

(لە نزیکەی هەمان کاتی کیپلەردا، گالیلۆ گالیلی زانای ئیتاڵی دەژیا... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 217، 219*، 252)

### Grimm; Jacob، Wilhelm گریم؛ یاکوب و ولیەم

برایانی گریم بەدرێژایی ژیانیان پەیوەندییەکی بەتین و گیانی بەگیانیان پێکەوە هەبوو. لەڕاستیدا یاکوب گریم (1785 تا 1863) و ویلیەم گریم (1786 تا 1859) توێژەرەوەی زمان بوون و وەک لاینگری ڕۆمانسیەت لە قەڵەم دەدرێن، هەر لە ڕێگەی بیرکردنەوەی ڕۆمانسیشەوە خۆشەویستیان هێنایە ناو دڵی خەڵکانی ئاساییەوە. ئەم دوو برایە بەڕاستی نزیکبوون لە خەڵکی ئاساییەوە و زۆر بە قووڵی بیریان لێدەکردەوە. نووسینی "حیکایەتەکانی گریم" پش بوونە چیرۆکێکی هەمیشە باوی کلاسیکی و ئێستاکەش "تاوناتاوێک" سەرنجی گەنجانی (خولیای کۆمپیوتەری) ئەمڕۆکە ڕادەکێشن. جگە لەمانەش برایانی گریم هەوڵیاندەدا سەرلەنوێ نەتەوەی ئەڵمانی پێکبهێننەوە، بۆ نموونە بەو مەبەستەی یاریدەی خەڵکی ئەڵمانی بدەن کە ئێستایەکی باشتر و داهاتوویەکی باشتر بەدەست بهێنن، دەهاتن داب و نەریتی کۆنی ئەڵمانییان زیندوو دەکردەوە، هەر وەک خۆیان دەیانگوت ("ئێمە هەستدەکەین هەموو شتێکی ئێستاکە بەهۆی هێزێکەوە دەڕوات بەرێوە کە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ڕابووردوو".)

(حەکایەتی برایانی گریمت بیستووە؟... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 376*، 531)

### Goethe، Johann Wolfgang گۆتە، جۆهان ۆلفگانگ

گۆتەی کەڵە نووسەر (1749 تا 1832) نزیکەی هەموو ژیانی وەک کەسێکی بەختەوەر بردەسەر، جارجارێکیش تێبینییە ورد و تێڕوانینە فەلسەفییە قوڵەکانی دەبوونە مایەی سەرسوڕمانی چواردەورەکەی. زۆرینەی ئەو شتانەی ئەم مامۆستایە دەیگوت لەوە دەچوو بەرێکەوت هەڵبرێژێت، بەڵام لەڕاستیدا چەندین هەقیقیتی قوڵی لەناواخندا گرتبووە خۆ وە بەئاشکرا نیشانیدەدا کە فەلسەفە بەردەوام پەیوەندی بە حیکمەتی ژیانەوە هەیە و کەمجار ڕێدەکەوێت لە چوارچێوەی تەسکی کتێبەکاندا قەتیس ببێت. لە نێوان ئەو هەقیقەتانەدا پێناسە جوانەکەیمان دێتە پێش چاو کە باس لەو "فۆرمە سەرنجڕاکێشانە دەکات کە بە شێوەیەکی پڕ لە ژیان گەشە بەخۆیان دەدەن"، یان کاتێک گوزارش لە فرەلایەنی ڕووناکی دەکات و دەڵێت؛ ("چاو وەکو خۆر وایە، ئەگەرنا، چۆن دەمانتوانی ڕووناکی ببینین؟"). گۆتە بەشێوەیەکی یەکجار بێوێنە ئەندێشە و بینینی لە سەرنجێکدا یان لە بیرۆکەیەکدا دادەڕشت، کەم دەبیبنین بیرکردنەوە و وێناکردن بەشێوەیەکی جودا لەیەک دەرببڕێت. زۆر بەڕوونی نموونەی ئەم حاڵەتەمان لە "فاوست"دا بۆ دەردەکەوێت کاتێک تەماشای تاقگەیەک دەکات و دەڵێت؛ "ڕەنگدانەوەی هەوڵ و کۆششی مرۆیی لەم

تاقگەیەدا دەردەکەوێت./ گەر بەقووڵی بیر لەمە بکەیتەوە، باشتر لێیتێدەگەیت؛/ بەشێکی کەمی ژیان لەناو ئەو وێنە جۆراوجۆرەدا دەردەکەوێت."

(جارێکیان گۆتەی شاعیری ئەڵمانی گوتی؛ "ئەو کەسەی لە مێژووی سێ هەزار ساڵی مرۆڤ بەئاگا نەبێت، تەنها بۆ ورگی دەژی"... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 176*، 319، 372، 455)

### لاپلاس، پیررێ سیمۆن دی Laplace، Pierre Simon De

لاپلاس "1749 تا 1827"زانای ماتماتیک و ئەستێرەناس و فەیلەسوفیش بوو. زیاتر لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەستێرەکان دەکرد؛ بەبڕوای ئەم ئەستێرەکان لە ئەنجامی خولانەوەی تەمێکی گازیی مەزندا دروستبوون. ئەم لە ڕێگەی "لاپلاسی شەیتان"ەوە ناوبانگی دەرکرد، کە کەسایەتییەکی هونەری تیۆرییە؛ زانیاری دەربارەی سەرجەم یاساکان و هێزەکانی سروشت هەیە و پەی بە بچوکترین جوڵەش دەبات، بەو شێوەیەش وەڵامی هەموو پرسیارێک دەداتەوە، واتە دەتوانێت باسی هەموو ڕووداوەکان بکات، لە هەرجێگایەکدا بێت و لە هەرکاتێکیشدا ڕووبدەن.

(پاشانیش "لاپلاس"ی زانای ماتماتیکی فەڕەنسی، بیرۆکەیەکی یەکجار میکانیکی ختسەڕوو... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 247)

### لامارک، ژان دی Lamarck، Jean De

لامارک "1744 تا 1829" یەکەمین کەسبوو کە زاراوەی بایۆلۆژی وەسفکرد. لامارک لە سەرەتادا ئەفسەربوو، دواتر لە پاریسدا بوو بە زانای گیانەوەرناسی. تیۆری ڕەچەڵەکەکەی (لامارکیزم) دەڵێت گۆڕانکاریە کاریگەرەکانی ژینگە، دەبنە هۆی گۆڕانکاری مادە بۆماوەکانی ئۆرگانیزم. ئەم لایەنە مرۆڤیش دەگرێتەوە. تیۆرییەکەی لامارک لە کاتی خۆیدا کاریگەرییەکی مەزنی هەبوو، بۆ نمونە کاریگەریی خۆی لەسەر لێکۆڵینەوەکانی داروین جێهێشت.

(...زانای گیانەوەرناسی فەڕەنسی لامارک یەکێک بوو لە دەنگە هەرە دیارەکان... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 436*، 440، 448)

### لامێتری، جوللیان ئۆفری دی Lamettrie، Julien Offray De

ئەو باسەی کە لە سەردەمی ئەمدا بەتەواوەتی ڕەتدەکرایەوە، لەوەدەچێت ئەمڕۆکە شایانی پەسەندکردن بێت و نزیکبێت لە ڕاستییەوە؛ ئەو دەیگوت؛ مرۆڤ ئامێرە ـ بێگومان وەسفێکی پڕاوپڕ نییە، بەڵام لەگەڵئەوەشدا ئەو ئامێرە لەناو چەند ملیارد مرۆڤێکدا بوونی هەیە. لە ڕاستیدا لامێتری "1709 تا 1751" شایانی ئەوەیە داوای لێبووردنی لێبکرێت، چونکە تەنانەت هاوبڕواکانیشی کە بەدوای ئەودا هاتن "مەتریالیستەکان و سۆسیالیستەکان" بەنزمی تەماشایاندەکرد و کەم دەیانئنرخاند. ئەو حیکمەتەی کە ئەم هەڵیدەڕشت، بەسە بۆ ئەوەی بە یەکجارەکی لە ناو خەیاڵدا دەرمانهێنێت؛ هزر، ئەو شتە

خۆ بەزلزانی لە خۆ بەبایی بووە، تەنها ئەو کاتە ئیشدەکات کە لەشێکی ساغ ڕێگەی پێبدات، هەمان شتیش بەسەر ڕۆحدا دەچەسپێت؛ ئەو شتەی مرۆڤێک دەیخوازێت، مرۆڤ خۆی نییە کە داوایدەکات، بەڵکو ئەو ئامێرەیە کە ژیانی مرۆڤی ڕاگرتووە ـ ئەمەش تەنها هەتاوەکو ئەو کاتەیە کە بوونی هەبێت

(لامێتری، کە پزیشکێک و فەیلەسوفێکی فەڕەنسی بوو، لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەدا کتێبێکی نووسی و ناوی نا "مرۆڤ ئامێرێکە"... جیهانی سۆفیا، لاپەڕ 247)

### لایبنیز، گۆتفرید ویللیەم Leibniz، Gottfried Wilhelm

ڕاستییەک دەڵێت؛ ناتوانین ڕۆح لەتبکەین و بیکەین بە بەشی بچکۆلە بچکۆلەوە، وە هێندەی ئاگاداریش بین هیچ کەسێک تا ئێستاکە ڕۆحی نەبینیوە، بەڵام لەگەڵئەوەشدا نامانەوێت دەستی لێهەڵبگرین. ئەم خاڵە لایبنیزی ڕووناکبیری مەزنیش دەگرێتەوە؛ ڕۆشنبیری ئەم پیاوە لەڕادەبەدەربوو، تەنانەت گەیشتە ئەو ڕادەیەی خەڵکانی سەردەمەکەی، ئەوانەی کە نەیاندەتوانی بە ئاستی ڕووناکبیری ئەو بگەن، ڕێزی لێنەگرن و بەهەموو شێوەیەک قسەو قسەلۆکیان بۆ هەڵدەبەست (بۆ نمونە دەیانگوت هەندێ لە زانیارییەکانی هی خۆی نییە و لە خەڵکانی ترەوە دزیویەتی). لایبنیز "1646 تا 1716" تورەدەبوو، بەڵام لەهەمان کاتدا دەستی بەسەر تورەبوونەکەیدا دەگرت. هیچ یەکێک لەو ورتەورتانە جیهانبینینی ئەوی نەگۆڕی؛ بەبڕوای ئەم گەردوون لە حاڵەتێکی پۆزەتیفی پڕاوپڕدایە (ئەو هاوئاهەنگییەی کە لەوەوبەر دەستنیشانکراوە). لایبنیز لە خێزانێکی پرۆفیسۆرەوە هاتە دونیاوە، لەبەرئەوە بەلای دایک و باوکیەوە ئاساییبوو کە لایبنیز لە تەمەنی گەنجیدا زیرەکی پێوە دیاربێت؛ دەیانگوت بێگومان گیا لەسەر بنجی خۆی دەڕوێتەوە. دوای تەواوکردنی زانکۆ لەگەڵ میر و بەگزادەکاندا کاریکرد، لەسەرەتادا لەگەڵ داروودەستەی شایانەی ماینزدا و دواتریش لە هانۆڤەر. لایبنیز کارە دبلۆماتیکییەکانی ئەنجامدەدا، ئەم پیشەیەش کاتێکی باشی بۆ ڕەخساند کە لێکۆڵینەوە زانستییەکانی بەڕێوەبەرێت و لەهەمان کاتیشدا نامەیەکی زۆری لەگەڵ کەسانی سەرکردە و گرنگی ئەو کاتەی ئەوروپادا دەگۆڕییەوە. دواتریش وەک وەزیرێکی تایبەت دامەزرا، دیسان ئەم کارەش پێویستی بە کاتێکی زۆر نەدەکرد. لایبنیز کەسێکبوو لە زۆر لایەنەوە بەهرەمەندبوو، تاڕادەیەکی زۆر فەرمانبەرانی سەروتری هەر کارێکیان پێ ڕاسپاردایە بە ئەنجامی دەگەیاند. بۆ ماوەیەک کاری دەرهێنانی کانزای شاخەکانی گرتبووە ئەستۆ و دواتریش لە کۆمپانیای پارە لێداندا دامەزرا. لەلایەکی تریشەوە شارەزاییەکی فراوانی لە یاسا و کاروباری یاسا دانان و دادپەروەیدا هەبوو، پاشان بە شێوەیەکی یەکجار نایاب و دڵسۆز بوو بە بەڕێوەبەری کتێبخانەیەک (دەتگوت خۆی هەموو کتێبەکانی نووسیووە). پاشتر، بۆ خۆشبەختی هەموو قوتابییەکانی نەوەکانی دوای خۆی، حسابی تەواوکاری و جیاکاری دۆزییەوە (تەماشای نیوتن بکە).

لە ناواخنی فەلسەفەی لایبنیزدا تیۆری "مۆنادە" بەدیدەکەین. مۆنادەکان (مۆنادە ووشەیەکی یۆنانیە و مانای "یەکە" دەبەخشێت) مادەی بنەڕەتی ئافەریدەیە و بچوکترین یەکەیە کە دابەشناکرێت. خوا ئەو یەکەیەی بە نایابترین شێوە دروستکردووە و بۆ

هەتاهەتایە دەمێنێتەوە، وە سەربەخۆییشی پێ بەخشیوە، لێرەشەوە پێویستی بەوە نییە کە ئاگاداربیێت. خشتەی کاتەکانیش بەتەواوەتی وەک مۆنادەکانن، ئەوانیش خۆیان لە خۆیاندا نەمرن، وە لەبەرئەوەی بەسەر بەشی بچکۆلەتردا دابەشناکرێن، هیچ جۆرە قەبارەیەکیان لە بۆشایدا نییە. بە یەکگرتنی مۆنادەکان شتێکی "کۆ" دێتەبەرهەم. یەکەکان سەربەستن و بەتەواوەتی پشت بە خۆیان دەبەستن. لایبنیز لە ڕستەیەکی بەناوبەنگیدا دەڵێت "مۆنادەکان پەنجەرەیان نییە"، بەڵام لەگەڵئەوەشدا توانایەکی تایبەتی بەرپەرچدانەوەیان هەیە؛ بەرپەرچی جیهان دەدەنەوە، وە لەبەئەوەی بێشومار و جۆراوجۆرن، بە چەندەها وێنەی بێشوماری جۆراوجۆریش بەرپەرچی جیهان دەدەنەوە. لایبنیز کاتێک دەیەوێت جیاوازی نێوان یەکە مادییەکان و یەکە ڕۆحییەکان نیشانبدات، دێت و باس لە ئاڵۆزی پرۆسەی مەعریفە دەکات؛ یەکە ڕۆحییەکان خاوەنی "جۆرە ئاگاییەکی ناوەکین"، واتە دەتوانن بەئاگابن لەخۆیان، دیسانەوە واتە دەتوانن بیربکەنەوە و هەستبکەن و شتیان لەیادبێت. لایبنیز دەیویست فەلسەفەیەک بخوڵقێنێت کە لەسەر دیدەیەکی پاک و شێوە زانستێکی گەردوونی دامەزرابێت. زانسیتێکیش کە هێندە ئەقلانی بێت، خەڵکی چاوەڕوانی شتێکی سەرسوڕهێنەر و گەورەی لێدەکات؛ زانستەکەی بەتەواوەتی بووە جێگەی متمانەی خەڵکی، وە بەڕاستیش لەو بڕوایەدابوون هەموو شتێکی لەتوانادابێت و بیریان لەوە نەدەکردەوە کە شیاوی ئەوە بێت چاوەڕوانییەکانیان بێ ئومێدبکات.

(یەکێک لە فەیلەسوفە گرنگەکانی سەدەی هەڤدە ناوی "لایبنیز" بوو، ئەو دەیگوت؛ گەورەترین جیاوازی شتی مادی و شتی ڕۆحی ئەوەیە کە شتی مادی بەردەوام ووردتر و ووردتر دەکرێتەوە، بەڵام ناتوانین ڕۆح بکەین بە دوو بەشەوە. جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 248*، 250، 278، 402)

**Luther، Martin** لۆسەر، مارتین

لۆسەر "1483 تا 1546" تەنها زانایەکی ئاین نەبوو، تەنها چاکسازێکی ئاینی توندوتیژ نەبوو، تەنها وەرگێڕێکی بەتوانا و بلیمەتی ئینجیل نەبوو، بەڵکو لەسەرو هەموو ئەمانەوە فەیلەسوفێکیش بوو کە توانا فەلسەفییەکانی خۆی کەم نەدەنرخاند. لە فەلسەفەوە، کە هیچ شتێکی نوێی پێ نەبەخشی، بە پلەی یەکەم فێری هونەری مامەڵەکردنبوو لەگەڵ بیروڕا دژ بەیەکەکاندا. بەڵکو لە ڕاستیدا فێری ئەوەش بوو کە بەبێ ئەوەی کاریگەری لێبکەن، پەسەندیانبکات؛ لەبەرئەوەی مرۆڤ ناچارە کە خۆی لەگەڵ گەورەترین لێکدژدا بژی کە خۆیەتی. ئەم خاڵەش پەیوەندی بە سەربەستی مرۆڤەوە هەیە وەک مەسیحییەک. سەربەستییەک کە بەڕواڵەت " لەناو شتەکان" ی سەر زەویدا دەردەکەوێت، بەڵام لەهەمان کاتدا بە بەراوردکردنی لەگەڵ خوادا کەم توانا و لاوازە. بەبڕوای لۆسەر ئێمە لە بەرامبەر خودادا هیچمان پێ نییە کە بیڵێین، بەڵکو تەنها ئافەریدەیەکی دەستی ئەوین و هیچی تر، ئەو لەم بارەیەوە دەڵێت؛ "دەکرێت مرۆڤ لەگەڵ ئەسپێکیماڵیدا بەراوردبکەین، کە یان خودا غارغارێنی پێدەکات یان شەیتان". لۆسەر وەک وەرگێڕێکی ئینجیل، چەندین کردەوەی نایابی ئەنجامدا، جگە لەوانەش خاوەنی چەندەها وتەی سەرنجڕاکێشەرە، لە یەکێک لەوانەدا دەڵێت؛ "ووشەی بوونەوەر مانای ئەوەیە کە دەنگت بە دەرەوە بگەیێنیت". سەبارەت بە ژیانی سەر زەویش

وتەیەکی پڕمانا و سەنگینی هەیە کە هەموو چیرۆک و مێژووی ئازاری پێدەکاتە شتێکی ناپێویست، ئەو دەڵێت؛ "بەکورتییەکەی، ئێمە سواڵکەرین و تەواو."

(لۆسەر گرنگ بوو، بەڵام ئەو تەنها چاککارێکی ئاینی نەبوو... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 227)

### Locke، John لۆک، جۆن

لەوە دەچێت هەندێ مرۆڤ بەم شێوەیە بیربکەنەوە؛ هەر خێرا کە شتێکیان زانی، ئیتر دەیانەوێت هەموو شتێک بزانن. جۆن لۆک "1632 تا 1704" ی فەیلەسۆف هەمیشە دەیویست هەموو شتێک بزانێت، لەبەر ئەم هۆیەش فەلسەفەی وەک بابەتێکی لاوەکی وەرگرتبوو، بەڵام لە هەمان کاتدا خەریکی بەرهەم هێنانی شەراب و خوێندنی زانستی دارایی و تیۆلۆجی و ئابووریناسی و زانستی یاسا و ماتماتیک و پزیشکی و جوگرافیا بوو. لەسەر ئەمانەشەوە وەک سیاسەتمەندێک و کارمەندێکی باڵای دەوڵەت و مامۆستایەکی پەروەردەیی و پزیشکێک خۆی نیشاندەدا؛ جگە لەمانەش یاریزانێکی باشی تێنسی سەر زەوییبوو. لۆک بنچینەدانەری ئیمپیرستی بەریتانییە. لە یەکێک لە ڕستە بنەڕەتییەکانیدا دەڵێت؛ هیچ شتێک، گەر لە پێشدا بە هەستەکانماندا گوزەری نەکردبێت، ڕێیتێناچێت لە هزرماندا بوونی هەبێت. لۆک دەڵێت ئەقڵی منداڵی، کە بە پلەی یەکەم نائەقڵانییە، وەک پارچە کاغەزێکی سپی بەتاڵ وایە کە تێبینییەکانی ژیانی لەسەر تۆماردەکرێت، ئەم چلاکییەش شتێکە کە بەدرێژایی ژیان بەردەوام دەبێت. زانینی ڕاستەقینە لە ئەزموونەوە سەرچاوە دێنێت، ئەم خاڵە بە ئاگابوون لە خودیش دەگرێتەوە (کە بەرهەمی پڕۆسیسی فێربوونە) وە هەروەها بیروبۆچوونەکانیش دەگرێتەوە (کە لە ڕێگەی بەراوردکاری و جەوهەر بینینەوە دێن). لە سەرو ئەمانەشەوە دەبێت ڕۆڵی زمان کەم نەنرخێنین؛ زمان کەرەسەی زانین بەرهەمدێنێت، واتە تەنانەت لە بیرکردنەوەی ناوەوەشماندا بەشێوەیەکی چالاک بنیاتنەرە. وەک ئاشکراشە لەبواری تێگەیشتندا ناتوانین دەستەبەرداری زمان بین. لۆک جۆرییەتی هەستەکانی بەم شێوەیە جودا دەکردەوە؛ جۆرییەتی هەستە سەرەکییەکان (*تێبینی؛ لە لاپەڕەی 281 ی جیهانی سۆفیادا چەندجارێک لە بری "سەرەکی" نووسراوە "سەرەتایی"، تکایە بەدڵێکی فراوانەوە ئەو هەڵەیە ڕاستبکەرەوە.و) (وەک قەبارە و فۆڕم و ژمارە و هتد) و جۆرییەتی هەستە لاوەکییەکان (وەک ڕەنگ و تام و هتد)، بێگومان بەم جوداکردنەوەیەی زانیارییەکی گرنگی خستە سەر تیۆری مەعریفە، بەڵام لە هەمان کاتدا داهێنانێکی بێچەندوچون نەبوو. گفتوگۆیەکی زۆر لەسەر ئەم بابەتەکرا و دواجار، لەدەرەوەی سنووری دوورگەی بەریتانیدا، ئایدیالیزمەکان وەریانگرت و جۆرە دیدە و ئەنجامێکی تەواو جیاوازیان پێبەخشی. بەڵام ئەم ئەنجامە شتێک نەبوو کە لۆک لێیبترسێت. لۆکی فەیلەسوف زیاتر وەک کەسێکی نائومێد خۆی نیشاندەدا، ئەم بێئومێدییەش دیدەیەکبوو کە ژیان بە شێوە گشتییەکەی بۆی دەسەلماند. ئیمپیریزم لە حاڵەتێکی بەهێزدا بوو، وە ئەو ئەزموونگەرییەی لە جیهاندا دەردەکەوت، ڕۆژ بەڕۆژ لەوەدەچوو بەردەوام تەرزی بیرکردنەوەکەیان بسەلمێنێت. هەرچەندە لۆک هەمیشە جیهان بینینێکی ڕیالیستی بە باشتر دەزانی، بەڵام لەگەڵئەوەشدا شتە جوانەکان و بەها نەمرەکانیشی دەبینی. فەلسەفەی ڕامیاری لۆک لیبڕالی بوو، وە لەسەر بنەمای بازاڕی ئابووری سەربەست

دامەزرابوو (کە تایبەتە بە خواست و خستنەڕوو)؛ ئەقڵ باڵاترین ڕێکخەری ئەو لایەنانەیە کە پەیوەندی بە کۆمەڵگاوە هەیە، وە ئەو شێوە تایبەتییەی مافی موڵکایەتیمان نیشاندەدات کە هەموو هاووڵاتییەک هەیەتی. بێگومان مافی هاووڵاتی بە موڵکەوە گرێدراوە؛ ئەو کەسەی کە موڵکی کەمە، خاوەنی ئەقڵییەتێکی زۆر نەبووە، وە لەبەر ئەمەش دەبێت مافی کەمتری هەبێت ـ جۆرە بۆچوونێکی ڕاشکاوانەیە، کە ئەمڕۆکەش چەند کەسانێکی کەم هەیانە، بەڵام تەنها لە خەڵوەتگاکەی خۆیاندا.

(بەتاڵ و بێمانا، وەک تەختەڕەشی ئەو پۆلەی پێش ئەوەی مامۆستا پێی تێبخات... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 250، 273*، 278، 282، 301، 334، 345)

### Logos لۆگۆس

لۆگۆس لە فەلسەفەی یۆنانیدا پرێنسیپێکی ئەقڵانییە کە گرێدراوی هێزە فۆڕم خوڵقێنەرەکانە. لەلای هیراکلیتس لۆگۆس یاسای گەردوونییە. وە لەلای ئەریستۆتالیس لۆگۆس شتێکە کە پەیوەندی بە ناواخنی پێناسە ئەقڵانییەکانەوە هەیە، لە کاتێکدا ستۆیکەکان لۆگۆسیان کردۆتە مرۆڤ و بە هاوتای ڕۆحی خوایانەی جیهان دایدەنێن. دواجاریش ئاینی مەسیحی ( بەتایبەتی لە پەیامەکەی جۆهانادا) لۆگۆس دەکاتە وشەی خودا، کە دواتر دەبێتە هۆی دروستبوونی جەستەی مرۆڤ و جەستەی کوڕی خوا (مەسیح).

(زۆر جار لە بری ووشەی "خودا"، ووشەی "لۆگۆس"ی یۆنانی بەکاردەهێنێ، کە مانای ئەقڵ دەبەخشێت... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 45)

### Lenin لینین

ئەم پیاوە هێندە گەشەی بە مارکسیزم دا کە چیتر لەڕاستیدا بوونی نەهێشت... لێرەدا مەبەست لە خودی فەلسەفەکە نییە، بەڵکو مەبەست لە خودی لینینە کە بە شێوەیەک یاریدەی پێشخستنی فەلسەفەکەیدا (لە ڕێگەی درێژکردنەوە و چەمانەوەیەوە) کە لەگەڵ ئامانجە تایبەتییەکانی خۆیدا بگونجێت. لەو کاتانەدا کە ئێستاکە بوونەتە ڕابووردوو، وەختێک کە دەسەڵاتی وڵاتێکی سۆسیالیزمی وەک کۆمۆنیزم خۆی نیشاندەدا، سەرکردە سیاسیەکان لەو بڕوایەدابوون کە خۆیان بیرمەندێکی پێشەواش بن. یەکێک لەوانە فلادیمێر ئۆلیانۆف (1870 تا 1924) بوو، کە دواتر وەک سەرکردە و پێشەوایەکی شۆڕشی ڕوسی ناوی "لینین"ی لە خۆی نا. لینین هەر لەکاتی خوێندنی ئامادەییەوە خولیای تیۆری مەعریفەبوو، وەک خاڵێکی بنچینەیش پێیوابوو زانین و کردار دەبێت هاوشانی یەکتر بڕۆن. لینین خاوەنی بەهرەی گومان نەبوو، ئەو دەیگوت؛ "ئاگایی کۆمەڵگا، بوونی کۆمەڵگا نیشاندەدات"، ئەمەش شتێک بوو کە دەکرا سیاسەتی پێوەبکرێت. لینین وەک فەیلەسوفێک یادناکرێتەوە، بەڵام لەگەڵئەوەشدا شتێکی تەواو ڕاستی دەربارەی خەڵکی ئەڵمانی گوتووە؛ ئەگەر ئەڵمانییەکان هەستن بە شۆڕش و بۆ نمونە بیانەوێت وێستگەیەک بگرن، ئەوا پێش هەموو شتێک ئەچن بلیتێک دەکڕن بۆئەوەی بچنە ناو وێستگەکەوە. هەرچەندە لەکاتی ئێستاکەدا چیتر پێویست ناکات بلیتت پێبێت بۆئەوەی

بچیته ناو ویستگەیەکەوە، بەڵام لەگەڵئەوەشدا ئەم وتەیەی بەتەواوەتی وەسفی ئەڵمانیەکان دەکات کە ناتوانن خۆیان بڕیاربدەن و بڕوا بە یاسا و دەسەڵاتدەکەن.

(لەم سەدەیەی خۆشماندا لینین و ستالین و ماو و چەندەهای تر بەشداری خۆیان خستە سەر مارکسیزم یان "مارکسیزمی لینینیزم". جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 419*، 428)

**لیۆناردۆ دا ڤینشی Leonardo، Da Vinci**

دا ڤینشی ئیتاڵی جگە لەوەی وێنەکێش و ئەندازیاری نەخشەی بیناساز و پەیکەرتاشیش بوو، توێژەرەوەیەکی بەهرەمەندی سروشتیش بوو، وە زیرەکبوو لە ئەنجامدانی ئەو تابلۆیانەدا کە سەبر و نەفەسدرێژیان گەرەکبوو. لیۆناردۆ "1452 تا 1519" لەناو زانستی سروشتدا جێگەیەکی گرنگ و دیاری بە نەخشە و سکێچی تیۆری بەخشی. لە ئەندێشەیدا وێنەی یەکەمین فرۆکە و پاپۆڕی ژێرئاوی خولقاند، ئەو نەخشانەش، کە ئەو شتانەی پێ نیشاندەدا، تەنها سەرنجراکێشەر نەبوون بەڵکو تەواو ڕاستەقینەبوون. لیۆناردۆ بڕوای بە مەعریفەیەکی گشتیبوو کە لەسەر بنەمای پەیبردنی هەستی و ئەزموونکردنەوە داڕێژرابێت، هەڵبەتە شتێکیش لەم جۆرە بێت لە دوا ئەنجامدا شتێکی یەکجار خەیاڵی لێدەردەچێت.

(بەڵام لۆسەر هەروەک فیسینۆ یان لیۆناردۆ دا ڤینشی هیومانیست نەبوو... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 228)

**مادە (جەوهەر) Substance**

ئەم زاراوەیە (سوبستانس) لە ووشەی لاتینی "سوبستانتیا"وە هاتووە و مانای شتێکی سەربەخۆ، شتێکی هەتاهەتایی، شتێکی بنەڕەتی دەبەخشێت. جەوهەر وەک تاشەبەردی قەراغ دەریاکان دیارە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر جار ناتەباین لەسەر ئەوەی چ شتێک جەوهەرە و چ شتێکیش جەوهەر نیە؛ دیکارتی فەیلەسوف دەیگوت دوو جۆر مادە (جەوهەر) هەیە؛ بیرکردنەوە و مەتریاڵ، لە کاتێکدا سپینۆزای هاوەڵی پێی وابوو یەک جۆر مادە (جەوهەر) بوونی هەبێت. بەلای ئەمەوە تەنها یەک مادە (جەوهەر) بوونی هەیە و بریتیە لە "خودا"، خوداش هەم سروشت و هەم هەموو شتەکانی تریش دەگرێتەوە. لەدوای سپینۆزاوە بەپلەی یەکەم کانتی فەیلەسوف بیری لە مادە (جەوهەر) دەکردەوە، ئەو دەیگوت؛ "ڕاستە دیاردەکان دەگۆڕێن، بەڵام جەوهەر وەک خۆی دەمێنێتەوە و ئەندازەی لە سروشتدا نە زیاددەکات و نە کەمیش دەکات". ئەمڕۆکەش زاراوەی جەوهەر هێندە باس ناکرێت (بەلایەنی کەمەوە لە فەلسەفەدا) وە زیاتر لە ناواخنی هەندێ باسی ئەقڵانی دیاریکراودا بەرچاودەکەوێت، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە زۆر جار هیچ جۆرە "جەوهەر"ێک، بۆ نمونە، لە دووتوێی گوتاری ئاهەنگەکان و وتارە ڕامیاریەکاندا بەدیناکرێت وە هەتاوەکو زیاتریش گوێ بۆ ئەو جۆرە وتارانە شلکەین، زیاتر و زیاتر هەست بە بێ "جەوهەر"یان دەکەین.

(لێرەدا دیکارت جەخت لەسەر بوونی دوو شێوەی جیاوازی هەقیقەت دەکات، یان دوو جۆر "مادە"؛ یەکەمیان بیرکردنەوەیە یان "ڕۆح"ە و دووهەمیش "درێژبوونەوە"یە یان "مەتریاڵ"ە... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 256*، 266، 279، 301)

**مارکس، کارڵ Marx، Karl**

کارڵ مارکس "1818 تا 1883" یەکەمین فەیلەسوف بوو کە توانی لایەنی کرداری فەلسەفە بکاتە شتێک کە بەکاربهێنرێت. تەنانەت جیهان بینینێکی تەواو بە ناوی ئەمەوە ناو نراوە (مارکسیزم، جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 419). ئەو بزووتنەوە رامیاریانەش کە پەیوەندیان بە مارکسیزمەوە هەیە (سۆشیالیزم و سۆشیال دیموکرات، جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 428، وە کۆمۆنیزم، جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 423) بۆ ماوەیەکی باش سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، بەڵام لە کاتی ئێستاکەماندا هێندە باویان نەماوە (بۆ نمونە سۆشیال دیموکرات) یان هەر بەتەواوەتی سڕاونەتەوە (بۆ وێنە کۆمۆنیزم). مارکسی کوڕە پارێزەر دەبوایە وەک باوکی بکردایە و یاسای بخوێندایە؛ پاشتر یاسای خوێند، بەڵام بەزۆرەملێ و بەبێ ویستی خۆی بوو. ئەو خۆی زیاتر بەلای فەلسەفەدا وەردەچەرخا، بەتایبەتیش فەلسەفەی هیگڵ، ڕاستە ئەو کاتە هیگڵ مردبوو بەڵام فەلسەفەکەی هێشتام کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو و قوتابیەکانی هێشتام مابوون. مارکس بە پلەی یەکەم گرنگی دەدا بە دیالێکتی فەلسەفەی هیگڵ و بەرەوپێشچوونی خۆیەتی فیکر لەلای هیگڵ، وە هەستی دەکرد ئەو دوو چەمکە هیگڵییە تا ئەو کاتە بەتەواوەتی تاوتوێ نەکرابوون و نەخرابوونە ژێر تاقیکردنەوەیەکەوە کە پەیوەندی بە ژیانی ڕاستەقینەوە هەبێت. ڕێک لەو کاتەشدا ژیانی ڕاستەقینە لایەنی هەرە وشک و ڕەقی خۆی نیشاندەدا. هەژاری و نەداری خەڵکانی کرێکار بەردەوام زیاتر و زیاتر دەهاتە بەرچاو؛ لە بەرامبەریشدا دەوڵەمەندی لەلای چەند "سەرمایەدارێک" کەڵەکە دەبوو. شۆڕشی پیشەسازی دەستی بەسەر پرۆسەی بەرهەمهێناندا گرتبوو، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە بەردەوام مەکینەکان شوێنی گرنگ لە پرۆسەی کاردا داگیربکەن و لێرەشەوە کرێکارێکی زۆر دووچاری بێکاربیبوون. دەتوانین بڵێین بەردەوام وێنەیەکی بەد و ناخۆش دەردەکەوت، وە هەتاوەکو بهاتایە ئەو وێنەیە زەقتردەبوو، چونکە لەلایەکی ترەوە بە ئاشکرا توانای هێزە ئابوورییەکان (زیادبوونی بەرهەم) دەردەکەوتن و لەهەمان کاتیشدا هێز و پەیوەندی بەرهەمهێنانی سەرمایە گەشەیدەکرد. هاوکات مارکس دکتۆرای لە فەلسەفەدا هێنا و ئا لەم بارانەدابوو کە بیروڕای هیگڵی هەڵگەڕاندەوە، مارکس دەیگوت "لەبری ئەوەی لەسەر سەر بوەستێت، هەڵمگێڕایەوە و خستمە سەر قاچ"، هەروەها دەیگوت "لە هەموو خاڵێکی قورسی فیکری ڕزگارمکرد و جێگایەکی کردەنیم لە ناوەڕاستی جیهاندا پێبەخشی". لەدواجاریشدا دەبێت مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی کارکەر ببینرێت، چەوسانەوە و "بەنامۆکردنی" مرۆڤ دەبێت کۆتایی پێبهێنرێت و فەلسەفەش دەبێت "لە ئاسمانەوە بهێنرێتەوە سەر زەوی". وە فەلسەفەی سەر زەویش دەڵێت "مرۆڤ باڵاترین بوونەوەرە بۆ مرۆڤ"، وە داوای ئەوە دەکات کە "هەموو ئەو بارودۆخانەی کە مرۆڤی سووک و ڕسوادەکرد، کە سەرکوت و ملکەچی دەکرد، کە وایلێدەکرد هەست بە تەنهایی و بێدەسەڵاتی بکات، کە بە چاوێکی نزمەوە تەماشای مرۆڤی دەکرد، هەموو ئەمانە دەبێت کۆتاییان پێبهێنرێت". مارکس لەدوای خوێندنەکەی وەک ڕۆژنامەنووسێک کاری دەکرد. فریدریک ئینگلس "1820 تا 1895"ی کوڕی خاوەن کارگە بووە هاوڕێی ژیانی، بەڵام

ئینگلس هەر زوو هەستیکرد دڵی بەلای سۆشیالیزمدا لێدەدات. ئینگلس زوو زوو هاریکاری مارکسی دەکرد، تەنانەت لە باری ئابووریشەوە. هەردووکیان پێکەوە بنکەیەکی نووسینیان دامەزراند و لەو ڕێگەیەوە ئەو جۆرە تیۆرییانەیان بۆ کرێکارانی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی دەنارد کە لە ژیانی ڕۆژانەیاندا بتوانن بەکاریبهێنن. لە پاش شۆڕشی 1848 مارکس لەگەڵ خێزانەکەیدا بەرەو بەریتانیا کۆچیکرد و هەتا مردنی لەوێدا نیشتەجێبوو، بەڵام ئینگلس لە کارگەکەی باوکیدا مایەوە، "لە ناو ئەو بازرگانییە ساردوسڕەدا" لەسەر کارکردن بەردەوامبوو، تەنها بۆ ئەوەی بتوانێت پارە بۆ برادەرەکەی و بزووتنەوەکەیان پەیدا بکات. لە هەمان کاتیشدا مارکس، لەسەر بنەمای خوێندنێکی بەگوڕ لە بواری ئابووری نەتەوایەتی و ڕامیاریدا، گەشەی بە تیۆرییەکی فەلسەفیدا کە سەرنجراکێش دێتە بەرچاو، چونکە باسی ڕێگەچارەی ئەو نەهامەتییە دەکات. لە یەکێک لە ڕستە بنچینەییەکانی ئەم تیۆرییە فەلسەفییەدا دەڵێت؛ "ئاگایی مرۆڤ، بوونی مرۆڤ دەستنیشان ناکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە بوونە کۆمەڵایەتییەکەیە کە ئاگایی مرۆڤ دیاریدەکات". لە قۆناغێکی دیاریکراوی گەشەکردنی کۆمەڵگادا، هێزی بەرهەمهێنەر لەگەڵ هەلومەرجی بەرهەمهێنانی باودا دژ بەیەک دەبنەوە، یان گەر بەشێوەیەکی یاساییانە دەریببڕین، لەگەڵ ئەو پەیوەندیە موڵکایەتییەکانەدا ناتەبادەبن کە هەتاوەکو ئەو کاتە هێزی بەرهەمهێنەر لە ناویدا جوڵاوەتەوە. واتە هێزی بەرهەمهێنەر لە حاڵەتی گەشە خوڵقاندنەوە هەڵدەگەڕێتەوە و دەبێتە زنجیرێک بۆیان. لەو کاتەدا قۆناغی شۆڕشی کۆمەڵایەتی دێتە ئاراوە. مارکس و ئینگلس پێیان وابوو کە شۆڕشی کۆمەڵایەتی لە ڕاستیدا هەر زۆر نزیکبێت؛ سەرمایە ناچاردەبێت گەشە بەخۆیبدات و خۆی فراوانبکات، لێرەشەوە بنەمای هەڵوەشاندنەوەی خۆی دادەمەزرێنێت، هەڵبەتە لەسەر دەستی ئەو کەسانەی کە تاوەکو ئەو کاتە ژێردەستە و چەوساوەبوون. وەک هەموومان دەزانین مارکس و ئینگلس ئەو شۆڕشەیان نەبینی کە هیوایبوون. ئەو شۆڕشە پاشتر ڕوویدا، بەڵام نەک هەر وەک ئەوەی ئەوان چاوەڕوانیبوون کە لە وڵاتێکی پیشەسازی پێشکەوتووی ڕۆژئاوادا هەڵگیرسێت، بەڵکو لە وڵاتی ڕوسیای دواکەوتوودا تەقییەوە. لەسەرەتادا ئەم دواکەوتنە مێژووییە ڕێگەی لە گەشەکردنی مارکسی نەگرت، بەڵکو خەڵکی ئومێدەواربوون کە دروشمەکەی بێتەدی؛ "فەیلەسوفەکان هەتاوەکو ئێستاکە بە چەند شێوەیەکی جیاواز تەنها جیهانیان لێکداوەتەوە، بەڵام ئێستاکە دەبێت بیگۆڕین". ئەو گۆڕانکارییانەی، کە لەڕاستیدا ڕوویدا، لە هەموو چاوەڕوانکردنەکانی فەیلەسوفەکان دوورکەوتەوە؛ لەوە دەچوو ئاگایی مرۆڤ نەتوانێت لەگەڵ ئەو ڕۆڵە لاوەکییەدا خۆی بگونجێنێت کە دەبوایە بیبینیبایە. ئاگایی لەلای هیگڵ خاوەنی ڕۆڵێکی سەرەکیبوو؛ دواتریش لەپاش مارکسەوە، دەبوایە چاوەڕوانی دەرەوەی بوایە و لە وێنەدانەوەیەکی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان زیاتر هیچ شتێکی تر نەبوو. گرفتی فەلسەفەی مارکسیزم لەو هەوڵ و تەقەلا ئاکاریە بێوچانەیاندا نەبوو کە بەدوای هەقانیەتێکدا دەگەڕان کە کەس نەیبینیوە؛ بەڵکو بە پێچەوانەوە گرفتەکەیان لەوەدابوو کە یەک لایەنبوون، لەوەدابوو کە خۆیان بە ڕاستیەکی پەتی دادەنا، ڕاستییەک کە هیچ جۆرە گفتوگۆیەک قبووڵناکات و لەسەروئەوەشەوە "بەڕاستی" لەو بڕوایەدابوون کە فەلسەفەی مارکسیزم پەردەی لەسەر ڕووی هەموو یاساکانی جیهان و مێژوو هەڵماڵیبێت و ڕەوتی گەشەکردنی پاشەڕۆژی دۆزیبێتەوە .ئەمرۆکە خاڵێکی تریشمان بۆ ڕوونبۆتەوە؛ ئەو وێنەی مرۆڤە کە مارکس سووربوو لەسەری، بە شێوەیەکی نەگەتیف یەکلایەنبوو؛ مرۆڤ خۆی بە تاوانبار

دادەنێت، هەڵبەتە بەردەوام خۆی لە ناو خۆهەڵسەنگاندنێکی تیۆری و کردەنی نائاسایدا خۆی دەبینێتەوە، لێرەشەوە وەک لێپرسراوێکی شمەک ڕەفتار لەگەڵ سروشتدا دەکات، وە هەستدەکات کە بەئارەزووی خۆی دەتوانێت هەموو ئەو سامانانەی، کە بەرپرسیارە لێیان، پڕاوپڕ بە پێی ویستی خۆی بیانهێنێت و بیانبات .

( ...تارماییەک بەناو ئەوروپادا تێدەپەڕێت... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 331، 411*، 417، 487، 489)

**Marcus Aurelius مارکۆس ئاورێلیوس**

مارکۆس "121 تا 180" لە کۆشکی قەیسەردا فەیلەسوف بوو، ئەم پلەوپایە بەرزەشی ئاواتێکی پلاتۆنی هێنایە دی؛ چونکە پلاتۆن دەیگوت ئەو فەیلەسوفانەی لە بواری فەلسەفەی مندا دەخوێنن، دەبێت ببنە فەرمانڕەوا. مارکۆس لە بواری ڕامیاریدا بەختێکی کەمتری هەبوو، بەڵام ئەمە پەیوەندی بە کەمبوونی هونەری فەرمانڕەواییەوە نەبوو، بەڵکو پەیوەندی بە بارودۆخی ئەو کاتەوە هەبوو؛ ئیمپراتۆری ڕۆمانی لە ڕماندابوو، یاخیبوونیش بە شێوەیەکی گشتی بڵاوبوو. قەیسەر بەردەوام لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەیگواستەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا ئازایانە بەردەوامبوو لەسەر نووسینە بەناوبانگەکەی کە ناوینابوو "تێڕوانینەکانم". مارکۆسی فەیلەسوف کاریگەری ستۆیکەکانی بەسەرەوەبوو، بەتایبەتیش بە چاوێکی ڕێزەوە تەماشای لایەنی ویژدانی ناوەوە و ئاکاری بەرزی ئەو تەرزی بیرکردنەوەیەی دەکرد، بەڵام لە دواجاردا توشی گومانبوو؛ لەلایەکەوە گەشبینییە ئەقڵانییەکەی هێدی هێدی بەرەو نەمان چوو، وە لەلایەکی تریشەوە چیتر نەیدەتوانی لەسەر هونەری خۆڕاگرتنی خۆی، کە بە هەموو شێوەیەک دەیویست بیهێڵێتەوە، بەردەوامبێت ـ لێرەشەوە بیرکردنەوە تاریکەکان دەستیان بەسەرداگرت؛ "هەموو شتە جەستەییەکان وەک ڕووبارێک وان، وە هەموو شتە ڕۆحییەکانیش خەون و خەیاڵن؛ ژیان واتە شەڕ.. ژیان واتە نیشتەجێبوون لە شوێنە نامۆکاندا."...

(...زۆربەشیان چالاکانە لەسەر ئاستی وڵات ڕۆڵیان دەبینی، بۆ نمونە مارکۆس ئاورێلیوس... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 142)

**Malthus، Thomas مالتۆس، تۆماس**

مالتۆس "1766 تا 1834" لە سەرەتادا قەشەبوو، دواتریش پلەی پرۆفیسۆری لە مێژوو و ئابووری سیاسیدا بەدەستهێنا. دەیویست لەبواری لێکۆڵینەوەی ژمارەی دانیشتواندا ببێتە تایبەتمەندێک، چونکە لەوەوبەر گفتوگۆی دژ بە زۆربوونی هەڕەمەکی مرۆڤایەتی دەکرد. بەپێی بیروڕاکانی ئەم، توانای خواردن پەیداکردن لەلایەن مرۆڤەوە بەتەواوەتی شانبەشانی ئەو هەموو منداڵانە ناڕوات کە دێنە ناو جیهانەوە. ئەم بیرۆکەیەی مالتۆس کە لە ناواخنیدا باسی مامناوەندێتی (خۆ پاراستننی) دەکرد، لەوە دەچێت لە ڕاستیدا ئاڕاستەی ئەم سەردەمەمان بکرێتەوە. مایەی سەرسوڕمان نییە کە مالتۆس ڕەشبینبوو؛ لە هەڵسەنگاندنەکانی دواتریدا بە قوڵی بیر لە شەڕ و نەخۆشی بڵاوبوونەوە دەکاتەوە و

دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە دەڵێت ئەم جۆرە دیاردانە دەکرێت کاریگەرییەکی "باشی" لەسەر زیادبوونی لەڕادەبەدەری مرۆڤایەتی هەبێت.

( ...بەڕێکەوت چاوی بە کتێبێکی چکۆلەی تۆماس مالتۆس کەوت. تۆماس تایبەتمەندبوو لە لێکۆڵینەوەی ژمارەی دانیشتواندا... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 442)

### Manichaean مانیکیزم

مانیکیزم لە ناوی "مانی" پارسییەوە "نزیکەی 216 تا نزیکەی 276" هاتووە. بیروڕای مانی بەتایبەتی لە سەدەی چواردا بڵاوبووەوە. مانیکیزم تێکەڵەیەکی بیروڕای مەسیحی و ئاینی پارسیبوو. لە ڕاستیدا ئاوگوستین پێش ئەوەی ببێتە بابە گەورەی کڵێسە، بۆ ماوەی دە ساڵی ڕەبەق مانیکەییەکی چالاکبوو. دواتریش وەک پلە بەرزێکی کڵێسەی مەسیحی دەیگوت؛ "من دەزانم باسی چی دەکەم!" و لێرەشەوە هاوبڕوا کۆنەکانی خۆی تاوانباردەکرد و ناوی "لادەری ئاینی" لێنابوون. مانیکەییەکان خاوەنی بیروڕایەکی توندی دوالیستیین. جیهان لە ڕێگەی دوو شتی نەمر، وە لە بنەڕەتدا هاونرخەوە، تەماشادەکەن؛ باشە و خراپە. وە لە تەنیشت ئەم دوو شتەوە هەموو لێکدژەکانی تر دادەنێن؛ ڕووناکی و تاریکی، جەستە و ڕۆح، ژیان و مردن. مرۆڤ بە درێژایی هەموو ژیانی ڕووبەڕووی ئەو حاڵەتانە دەبێتەوە کە ناچارە لایەکی دیاریکراو هەڵبژێرێت. لێرەشەوە لەوە دەچێت مرۆڤ لە مانیکیزمدا سەربەست بێت لە هەڵبژاردنەکانیدا؛ هەڵبژاردنێک کە دواتر لە ئاینی مەسیحیدا بەتەواوەتی لەبەردەستدا نەبوو.

(مانیکەیی مەزهەبێکی ئاینییە، کە لە سەردەمی سینانتیکدا زۆر باو بوو. جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 188)

### Mao Zedong ماو زیدۆنگ

ماو زیدۆنگ "1893 تا 1976"، کە لەوەوپێش بەڕێزەوە "یان لەڕاستیدا لە ترسدا" بە ماو تسی تۆنگ ناوەکەیان دەنووسی، هەروەک لینین و ستالین هەمان شتی بەسەردا دەچەسپێت؛ مێژوو (هەتاوەکو ئێستاکە) وەک کەسانێکی نەخوازراو ناویاندەبات. ماو، کە ماوەیەک لەمەوبەر کەبتاینی کەشتی شۆڕشی چینی بوو، هەروەک لینین و ستالین (لە فەرهەنگەکەدا تەماشایان بکە) فەیلەسوف بوو، واتە خۆی خۆی بە فەیلەسوف دادەنا، ئەمەش لە ڕاستیدا شتێکی سەیر نەبوو، چونکە بەپێی ئایدۆلۆژیای نائاسایی ئەو کاتەی کۆمۆنیستی هەموو کەسێک دەکرا وە دەبوایە هەموو شتێک بوایە؛ دەبوایە ماسیگر و ڕاوچی و کرێکار و فەرمانبەر بوونایە ... ئەی بۆ نەکرێت فەیلەسوف و نووسەر و بیرمەندیش بن. ماو، وەک فەیلەسوفێک، یەکێک لە کتێبە بەناوبانگەکانی مێژووی فەلسەفەی نووسی، ئەو کتێبەی کە ناوی "کتێبە سوورە بچکۆلەکەی ماو"ە؛ کۆمەڵێک پەندی شەڕخوازی تێدا کۆکردۆتەوە و کۆمەڵێک خەڵکی ئارەزوومەندی ئەو کاتەی پێ سەرسامدەکرد. لەو کتێبە سوورەدا چەندەها ڕستە دەبینین کە زۆر بەئاسانی دەکرێت لە پەیمانگا ڕەسمییەکانی وەک فێرکردنی چۆنییەتی بەڕێوەبردندا بەکاریان بهێنین، هەڵبەتە مەبەست لەو شوێنانەیە کە خەڵکی "زۆر بە جوانی خۆیان دەڕازێننەوە" و پەرۆشی ئەوەن خوێندنێک تەواوبکەن. ڕستەکان دەربڕینی شتێکی تورەهات و سادەن، بۆ

نمونە دەڵێت "لە هەموو کێشە و مەسەلەیەکدا دەبێت مێشکی خۆمان بەتەواوەتی بگوشین و زۆر بەگوڕ سەرلەنوێ بەقووڵی بیریلێبکەینەوە"، یان بۆ نمونە کاتێک کە دەڵێت "بیرکردنەوەی مرۆڤ دەبێت لەگەڵ گۆڕانی بارودۆخدا خۆی بگونجێنێت"، بێگومان ئەم ووتەیەشی هیچ ناواخنێکی زیاتری لە ووتەکەی پێشوتری لە خۆنەگرتووە.

(لەم سەدەیەی خۆشماندا لینین و ستالین و ماو و چەندەهای تر بەشداری خۆیان خستە سەر مارکسیزم یان "مارکسیزمی لینینیزم"... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 419)

### Muhammed محەمەد

محەمەد "570 تا 632"ی بنچینەدانەری ئیسلام، لە سەرەتادا بازرگانێکی بەڕێزبوو. بەو شێوەیەش لە ڕێگەی سەفەرەکانییەوە ئاشنایی لەگەڵ ئاینی مەسیحی و یەهودی و ئاینەکانی تریشدا پەیداکرد. لە ساڵی 610 دا چەند سروشێکی بۆ هات و وەک پێغەمبەرێک خۆی ناساند. وتارە ئاینییەکانی لە شاری مەکەدا بڵاوکردەوە؛ شاری مەکە جگە لەوەی کە لایەنگرەکانی ئەوی لێبوو، زۆر بە ڕێزو نرخەوە لە قورئانیشدا ناوی هاتووە. لە ئیسلامدا محەمەدی پێغەمبەر و نوێنەری مەزنی خوای تاقانە، وەک هەقیقەتێکی نەگۆڕ و بێچەندوچون تەماشادەکرێت و پلەی یاسا و دەستوری بەدەستهێناوە.

(پاش مردنی محەمەد لە ساڵی 632 دا، ئیسلام دەسەڵاتی بەسەر باکوری ئەفریقا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا گرت. جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 186)

### Mystic میستیک

(*لە کتێبەکەی جیهانی سۆفیادا،لاپەڕە 147 بە "ڕۆحانییەت" وەرگێردراوە)mystic
ووشەی "میستیک" لە بنەڕەتدا لە ووشەی یۆنانی "مبین"ەوە هاتووە کە کتومت مانای "چاو نوقاندن" دەبەخشێت. هەر لە ڕێگەی ناوەکەوە دەتوانین پەی بە شوێنی ئەزموون وەرگرتنی ڕۆحانییەکان بەرین؛ چاو دەنوقێنن و لەناو مێشکیانەوە دیدەکان دێن. واتە کەسە ڕۆحانییەکە هەوڵدەدات بگەڕێتەوە سەر بنچینەی ڕۆح، لەم ڕێگەیەشەوە دەخوازێت لە ناواخنی بوونی ناوەوە تێبگات (بەلای زۆرینەی کەسە ڕۆحانییەکانەوە ئەو بوونە ناوەکییە، "خود" نییە) و بەو شێوەیەش دەتوانێت لەگەڵ خوادا ببێتە یەک. لە ڕۆحانییەتدا، کە وەک فەلسەفە خاوەنی مێژوویەکی کۆنە، زەنگی هەرە دێرینی پەرۆشی مرۆڤ و ترسی بەردەوامنەبوونی لێدەدات، هەروەها نیشانەی دڵەڕاوکێی هەستکردن بە کورتی بوون نیشاندەدات.
بزووتنەوە ڕۆحانییەکان لە هەموو سەردەمێک و هەموو کەلتورێکدا هەبوون. ئەمرۆکە خەڵکی لەو بڕوایەدان کە ئەزموونی ڕۆحانی (بەتایبەتیش ئەو جۆرانەی لە دەوری بازنەی خۆدۆزینەوەدا دەخولێنەوە) شتێک بێت کە شیاوی فێربوون و بڵاوکردنەوەبێت، لەبەرئەوە خەڵکانی "پسپۆڕی خۆدۆزینەوە" (بێگومان خۆیان بەدوای خۆیاندا گەڕاون و خۆیان دۆزیوەتەوە) چەندەها خولی وانەگوتنەوە و کتێب دەخەنە بەردەست، چەندین

تەکنیکی خەڵوەت و ڕێگەی ئاسوودەبوون هەڵدەڕژن، هەروەها بواری سەفەرێکی یەکجار سەرنجڕاکێش بۆ ناو چەقی مرۆڤ دەخەنەڕوو.

(لە ڕۆحانیەتی ڕۆژئاوادا ـ واتە لە ناو ئاینی جولەکە و مەسیحی و ئیسلامدا ـ ڕۆحانیەکان جەخت لەسەر گەیشتن بە خوایەکی تایبەت دەکەن... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 149)

**Mill، John Stuart میل، جۆن ستیوارد**

میل "1806 تا 1873" نووسەر و ئابووریناس و فەیلەسوف و ئەندامی پەرلەمانیش بوو؛ بەڵام بۆ ماوەی 35 ساڵ لە کەمپانیای بازرگانی ڕۆژهەڵاتی هندیدا کاریکرد. لەوێدا، هەروەک خۆی دەیگوت، "توانیم جیهانی ڕاستەقینە بخوێنم". لە بواری فەلسەفەشدا لە هەمان ڕێبازی باوی ئیمپیریستە بەریتانییەکانەوە دەستیپێکرد. بەلای ئەمەوە زانست لەسەر ئەزموون هەڵدەچنرێت؛ بەڵام نەک بە شێوەیەکی کوێرانە بیکەینە جێی متمانەمان، ئەم حاڵەتە بەتایبەتی ووردبوونەوە هەستییەکانمان دەگرێتەوە کە بنچینەی ئەزموونن، لەبەر ئەم هۆیەش دەبێت بینینەکانمان چەندین جار تاقیبکەینەوە و چەندین جاریش پیایاندا بچینەوە. دواترش بووە قسەکەرێکی ئافرەتان و سووربوو لەسەر ئەوەی بەتەواوەتی داوای مافی بەرابەری ئافرەتان بکات. ئەمڕۆکە کتێبی "ملکەچکردنی ئافرەتان"ە کەی میل لە ئەدەبیاتی ناوبراو بە ئەدەبیاتی ئافرەتاندا، وەک کتێبێکی بەنرخ و تایبەت تەماشادەکرێت.

(... لێرەشەوە کاریگەریەکی گەورەی لەسەر "جۆن ستیوارد میل"ی هاووڵاتی خۆی هەبوو، کە پاشتر ڕۆڵێکی گرنگی لە داواکردنی یەکسانی نێوان هەردوو ڕەگەزەکەدا بینی... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 283)

**Montesquieu، Charles مۆنتیسکیو، چارلس**

مۆنتیسکیو "1689 تا 1755" پارێزەر و فەیلەسوفی دادوەری بوو، هەر هێشتام لە کاتی ژیانیدابوو کە وەک ئەفسانەیەک دەرکەوت؛ کۆشش و چالاکییەکانی دەنگیاندایەوە، زانست و زانیارییەکانی هاتە بەرهەم، کتێبخانەکەی مایەی سەرسوڕمان بوو، لەسەرو ئەمانەشەوە هەروەک دەڵێن ئەم بوو کە یەکەمجار پێڕستی (*ڕێکخستنی پەڕتوک، ناوی دانەر...هتد، بەپێی ڕێکخستنی ئەلف و بێیی لەسەر پارچە کارتێک) داهێنا. تێکۆشانی مۆنتیسکیو بۆ دابینکردنی مافی بەگزادەکانبوو، وە خۆشی سەر بەو کۆمەڵەبوو؛ ئەگەر بەگزادەکان هاوسەنگی تووندڕەوەکان نەکەن، ئەوا وڵات یان لە ناو "دیکتاتۆرە ڕۆژهەڵاتییەکاندا" ووندەبێت یان لەناو "دیموکراتی"دا دەفەوتێت. وەک فەیلەسوفێکیش، یەکێک بوو لەو کۆمەڵناسە یەکەمینانەی کە سەریانهەڵدا. خوێندنەکەی سەبارەت بە شێوازی کارکردنی ڕژێمی دادوەری و وڵات بوو، وەک خاڵێکی هەرە بنچینەیش دەیگوت؛ کارکردن لەسەر پەیوەندیەکانی سروشت و لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو دامودەزگایانەی مرۆڤ خولقاندونی، بەلای کاری زانستەوە هیچ جیاوازییەکی نییە. بیرۆکەی مۆنتیسکیو سەبارەت بە دابەشکردنی دەسەڵاتی وڵات بەسەر سێ بەشدا (دەسەڵاتی یاسادانەر

"پەرلەمان" و دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن "وەزیرەکان" و دەسەڵاتی حوکمدەرکردن "دادگا") لەلایەن نزیکەی هەموو مۆدێلەکانی دەستوری بنەڕەتی ئەو شێوە وڵاتەوە پەسەندکرا کە خۆی زۆری بەدڵنەبوو ؛ ئەو شێوە وڵاتەش "وڵاتێکی دیموکراتی" بوو .

(ئەم سێ دابەشکردنە، لەلایەن "مۆنتیسکیو"ی فەیلەسوفی سەردەمی ڕۆشنگەری فەرەنسییەوە هاتووە. جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 283*، 334)

#### Monisim مۆنیزم

بەبڕوای مۆنیزم جیهان و هەموو شتێکی دی کە سەر بە ژیانە، لە هەمان مادەیەکی (جەوهەرێکی) بنچینەیی بەیەکەوە بەستراو پێکهاتووە. دەکرێت ئەو مادەیە (جەوهەرە) خودابێت، یان ئاگاییەک بێت کە هەموو شتێک دەستنیشان دەکات، یان ڕۆحانیەتێک بێت کە هەموو شتێک دەگرێتەوە، یان دەکرێت "یاسایەکی جیهان بێت" (هیراکلیتس). بەڵام لەهەمان کاتیشدا ڕێیتێدەچێت (ئەمەش بڕوای هەندێک لە فەیلەسوفە سەرەتاییەکانی یۆنانە) مادەیەک هەبێت کە بەرپرسیاری دروستکردنی ئافەریدەکراوەکان و چالاکی بوونەکان بێت. مۆنیزم بڕوا بە یەک جۆرە خودای دەسەڵاتدار دەکات؛ لێرەدا لەبنەڕەتدا باس لە بابەتێک دەکەین کەپێی دەگوترێت مۆنۆتیزم "جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 165"؛ ئاینی یەهودی و ئیسلام بە تەواوەتی مۆنۆتیزمن، لەکاتێکدا ئاینی مەسیحی، وەک ئاشکرایە ئەمیش بڕوای بە یەک خودا هەیە، نمونەی شێوەیەکی مۆنیزمی جیاوازترە و لە بوارێکی "سێ لایەنی تەبا"دا خۆی دەبینێتەوە، ئەو سێ لایەنەش خودای باوک و کوڕی خودا و ڕۆحی پیرۆزە .

(ئەوان دەیانگوت تەنها یەک سروشت بوونی هەیە. بەم جۆرە تێگەیشتنەش دەگوترێت "مۆنیزم". جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 142)

#### Materialism مەتریالیزم

مەتریالیزم هەروەک بەرامبەرە مەزن و دێرینەکەی، ئایدیالیزم، ڕەوتێکی کۆن و مەزنی فەلسەفییە، بەڵکو پێدەچێت دێرینتر و مەزنتریش بێت چونکە پشت بە هەڵسەنگاندنێکی ڕاستەقینانەی شتەکان دەبەستێت. شێوە هەڵسەنگاندنێکی بەم جۆرەش بەپێی پێویستی دەبێت هەر لە سەرەتاوە لەسەر بنەمای زانینێکی ئەبستراکت (کە مافی خۆیەتی گەر شانازی بە ئامانجەکانییەوە بکات) دامەزرابێت، چونکە ئەگەر وەک هەقیقەتێک دان بە هەبوونی فیزیاویماندا نەنێین، ئەوا ناشتوانین یاری ئاگایی یان ئەکرۆپاتی بیرکردنەوە بەڕێوەبەرین. مەتریالیزم هەمیشە لە مێژووی فەلسەفەدا بەشێوەیەکی کەمێک بەخەگرانە دەرکەوتووە، وە ئەرکی ئەوەبووە کە پاڵێک بە مشتومڕە چەقیوەکانەوە بنێت. ئەگەر گوێ بۆ مەتریالیستێکی شارەزا شلبکەین، کاتێک کە جیهانمان بۆ لێکدەداتەوە، ئەوا لەدوای باسکردنەکەیەوە بەئاسانی هەست دەکەین سەربەستتر هەناسەدەدەین ـ واتە بۆماندەردەکەوێت کە هەموو شتێک هێندە ئاڵۆز و دژوار و سەیر و نائاسایی نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە چەند ڕاستییەکی سروشتیمان هەیە کە ناتوانین خۆمانی لێ

لابدەین. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا مشتومڕە مەتریالیستییەکان، کە هەر لە پێشترەوە لەلای دیمۆکریتس و ئێپیکور دەیانبینین، هەمیشە ئەو کاتانە بەهێزتربوون کە زیاد لە ڕادە تێپەڕنەبوون و نەبوونەتە هۆی ئەوەی ببنە یاسا داڕێژ، چونکە ئەم لایەنەشیان ڕوویداوە، هەر بۆ نمونە ئەو شتەی کە پێیدەگوترێت مەتریالیزمی دیالێکتی کە مارکس دایمەزراند. هەڵبەتە ڕووشیداوە کە فەیلەسوفێکی باشی مەتریالیش خاوەنی خەونی ڕۆژانەی خۆی بێت، خاوەنی تێڕوانینی سۆفییانەی خۆی بێت، خاوەنی چەند ساتێکی خواوەندانەی خۆی بێت، لەم بارەیەوە دەتوانین "دێنیس دیدرۆ 1713 تا 1784"ی فەیلەسوف و بلیمەت وەک نمونەیەکی نایاب بهێنینەوە. دیدرۆ وەسفی ئەو حاڵەتە دەکات کە مرۆڤ هەست دەکات بەشێکە لەناو سەرجەمێکی گەورەتردا، شتێک کە لە خودی خۆی مەزنترە و لێی تێپەڕدەبێت و لەم بارەیەوە دەڵێت؛ "ئەو بوونی هەیە و مرۆڤیش بوونی هەیە. هەموو شتێک سوودی خۆی هەیە، هەموو شتێک ئامانجێکی هەیە، هەموو شتێک کاریگەری خۆی لە ناو سەرجەمدا هەیە... مرۆڤ هیچ شتێک نییە... ئارام بە، هێمن بە، وەک هەموو ئەو شتانە بە کە لەچواردەورتایە... واز لە کاتژمێرەکان و ڕۆژەکان و ساڵەکان بهێنە با وەک هەموو شتەکانی چواردەورت بڕۆن، وە خۆشت وەک هەموو شتەکانی چواردەورت بڕۆ"

(دواهەمین ڕێباز کە دەبێت ناوببرێت "مەتریالیزمە"... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 246، 495*)

### Jesus Christ مەسیح (جیسوس)

بیروڕای مەسیح کتومت وەکو مانای ناوەکەی وابوو (جیسوس "مەسیح" ووشەیەکی یۆنانییە کە لەسەر ووشەی "جیسوا"ی عیبرییەوە داڕێژراوەتەوە)؛ "جیسوس" واتە "خوا کۆمەک دەکات"، مەسیحیش هەم بە ووشە و هەم بە کرداریش وێنەی ئەو پەیامەی دەنواند. هاوکات مەسیح بۆتە کەسێکی پڕنهێنی، چونکە ئەو باسانەی کە پەیماننامەی نوێ دەیانگێڕێتەوە، بەس نین بۆ ئەوەی بتوانین وێنەیەکی مەسیحی مێژووییمان بۆ دەرکەوێت، لێرەشەوە کۆمەڵێک گومانی زۆر سەرهەڵدێنن. جگە لەمەش پەیامی ئینجیل بەمانای ووشە یەک لایەنییە؛ هانا دەباتە بەر "ئیمان"، واتە بڕواکردن بە هەموو شتێک کە بەناوی مەسیحەوە گرێدراوەتەوە، بۆ نمونە کارە باشەکانی، چاککرنەوەی نەخۆشەکان، موعجیزەکانی. تەنانەت ئەو شتانەش کە ڕێیانتێناچێت، وەک سەلماندنی یەقینێک دەردەکەون کە لەبەردەستدایە؛ بەڵام ئەمە بەس نییە بۆ ئەوەی کەسانی دەم بەگلەیی قەناعەت پێبکات. مەسیح وەک واعیزێک خۆی نیشاندەدا. ئەو دەیزانی چۆن چۆنی ئامرازەکانی دەستی هەڵسەنگێنێت، وە دەیتوانی بەچەندین شێوە خۆی دەربڕێت؛ جارجارێک توند و تیژبوو، هەندێ جاری تریش میهرەبان و نەرم، دەیزانی لە چ کاتێکدا دەبێت بەکردارێک هەستێت و لە چ کاتێکی تریشدا پێویستی بە قسەکردنە. مەسیح، هەروەک لە ئینجیلدا نووسراوە، لەگەڵ دەستەی سەردەستدا دەکەوێتە قەیرانەوە، لەبەرئەوەی نەیدەویست لەسەر تەرزی ژیانی ئەو کاتە بڕوات کە سیمایەکی لوتبەرزی فیکری و لەخۆبەباییبوونێکی ڕۆحی پێوەدیاربوو. ئەو پەیامەی لەگەڵ خۆیدا هێنای زیاتریشی دەگرتەوە؛ مەملەکەتی خوای هێنایە سەر زەوی، ئەو مەملەکەتەی کە خەڵکی وا چاوەڕوانبوون بە بۆنەیەکی یەکجار تایبەتی و بێ وێنەوە ڕووبدات. جگە لەمەش ئەو خوایە توندوتیژ و تاریکەی پەیماننامەی کۆنی کردە خوایەکی دڵئاوا و خۆشەویست.

لەبەرئەمەش هیچ پێویستناکات سەرمان لە بێبەزەیی کەسانی هەڵگری باوەڕە کۆنەکە بسوڕمێت. کەواتە ڕێتێدەچێت کە مەسیح خۆی کەسێکی لەخۆبایبووی پێداگر بووبێت (کە سادەیی و باشییەکانی هەمیشە بۆی نەدەپۆشی) و پێدەچێت هەر ئەم حاڵەتەشی بە چارەنووسی خۆی گەیاندبێت. لەخۆبایبوونێک کە هەر لە شێوازی قسەکردنەکانیا دەردەکەوێت؛ بۆ نمونە لە زۆربەی ئەو شتەنەی کە ڕوونی دەکاتەوە بەم شێوەیە دەستپێدەکات "بەڵام من پێتان دەڵێم" وە لێرەشەوە ئاشکرایە کە چاوەڕوانی هیچ جۆرە ڕەخنە و گفتوگۆیەک نییە لەسەر قسەکانی.

(هەم سوکرات و هەم مەسیحیش بەلای خەڵکانی سەردەمەکەیانەوە، وەک مرۆڤێکی پڕنهێنی تەماشادەکران. جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 40، 75، 77*، 84، 127، 134، 148، 161، 169،175، 182، 184، 186، 191، 194، 264، 319، 336، 404، 419)

**Novalis نۆفالیس**

لەڕاستیدا ناوی فریدریک هاردنبێرگ بوو، بەڵام وەک نووسەرێکی سەدەی ڕۆمانسی ناوێکی هونەری بۆ خۆی دانا (نۆفالیس)، کە تاڕادەیەک مانای "چێنەری وڵاتێکی نوێ" دەبەخشێت. نۆفالیس "1772 تا 1801" نووسەر و فەیلەسوفیش بوو، بەلای ئەوەوە نووسەر و فەیلەسووف جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە، چونکە ئەدەب و فەلسەفە "کلیلێکی زۆر "تایبەتی خودی خۆی" یان پێبەخشیبوو. وەک نیتشە دەیتوانی بەشێوەیەکی بێوێنە سەبارەت بە شتە بێوێنەکان بنووسێت، وە هەروەک نیتشەش زۆر زوو کامڵبوو و لە ماوەی چەند ساڵێکی کەمدا ئەزموونی ژیانێکی دوورودرێژی کۆکردەوە. نۆفالیس لاکەی تری هەقیقەتی دەبینی، ئەو لایەنانای دەبینی کە لە ناو شتە کورتخایەنەکاندا دەمێننەوە، لەمەش زیاتر بوونەوەرێکی ڕەسەنی لە خوددا دەبینی و هەموو مرۆڤایەتیشی لە مرۆڤێکدا دەبینی؛ "زانین شتێکی گشتییە و نەبەستراوەتەوە بە کەسێکی تایبەتەوە... کۆتایی هاتنی خودی تاکایەتیمان تەنها کۆتایی بە فۆڕمە تاکەکان دەهێنێت... مردن تەنها کۆتایی بە خۆپەرستیمان دەهێنێت... شتە ڕێکەوتەکان "تاکایەتیەکان" هێدی هێدی بەرەو فەوتان دەچن و شتە باشەکانیش دەمێننەوە. شتە گشتییەکانیش بەردەوام لە هەموو چرکەیەکدا بوونیان هەیە، چونکە لەناو سەرجەمدان "لەناو گشتدان". لە هەموو چرکەیەکدا لە هەموو دیاردەیەکدا، سەرجەم بوونی هەیە ـ مرۆڤایەتی، شتە هەتاهەتاییەکان لە هەموو شوێنێکدا لەبەردەستدان...". لە ڕوانگەی جیهان بینینێکی ئاوهاوە سنوورە باوەکان بوونیان نامێنێت، تەنانەت ئەو سنوورانەش کە لە نێوان خەون و بەئاگابووندان، لێرەشدا چەند مەترسییەک سەرهەڵدەدات، بۆ نمونە لە بواری وێنەکێشاندا کاریگەرییەکی هێندە گەورە لەسەر وونبوونی هەقیقەت جێدێڵێت کە کەم ناکرێتەوە. بەتایبەتیش نۆفالیس نەک تەنها سووربوو لەسەر فرە بەرهەمی خەون، بەڵکو لەڕاستیدا وەک هێزێکی بنیاتنەری هەقیقەتیش دەیبینی، لێرەشەوە بە ئاشکرا دەڵێت تەنها لایەنە مادییەکان سەرجەمی زانیاریمان دیاریناکەن، بەڵکو ناوەوەشمان گرنگە؛ ناوەوەمان واتە ئەو شوێنەی ڕۆح و دڵی مرۆی تێدایە، ئەو شوێنەی دەوڵەمەندی ڕاستەقینەی مرۆڤی تێدایە؛ "ئێمە خەون بە سەفەرێکی ناو گەردوونەوە دەبینین؛ باشە، بەڵام مەگەر گەردوون لەناو خۆماندا نەبێت؟ ڕێگا هەرە نهێنییەکە بەرەو ناوەوە

دەڕوات. نەمری هەموو ئەو جیهانانەی کە گوزەریانکردووە و ئەوانەش کە دواتر دێن، لەناوەوەماندایە و لە هیچ جگەیەکی تردا بوونیان نییە... یەکەمین بلیمەت، کە بەتەواوەتی چووە ناو قولایی خۆیەوە، ماکی بێسنوور و نمونەیی جیهانی خۆی دۆزییەوە... لە هەموو ساتێکدا مرۆڤ دەتوانێت ببێتە بوونەوەرێکی سەروسروشتی، وە بەبێ ئەو ساتانە مرۆڤ نابێتە کەسێکی سەر ئەم زەوییە، بەڵکو دەبێتە ئاژەڵێک."

("نۆڤالیس" کە یەکێک بوو لەو گەنجە بلیمەتانە دەیگوت؛ "جیهان دەبێتە خەونێک و خەونیش دەبێتە هەقیقەت"... جیهانی سۆفیا،لاپەڕە 369*، 371، 373، 378)

**Nietzsche، Friedrich نیتشە، فریدریک**

نیتشە "1844 تا 1900" جۆرە ئەفسونێکی بە فەلسەفە بەخشی، کە لەوەوپێش هەرگیز بە خۆیەوە نەیدیبوو. ئەمەش بە تایبەتی دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە نیتشە جگە لە فەیلەسوفییەکەی، نووسەریش بوو. ئەو نووسەرێکی فرەلایەنبوو و دەیتوانی هەموو ڕەنگەکانی (شێوە جیاوازەکانی) ئەزموونی جیهانی و ئەزموونی خۆیی دەرببڕێت. بەناوبانگییەکەی نیتشە هۆیەکی تریشی هەبوو؛ ئەو هەموو ژیانی خۆی بۆ فەلسەفە تەرخانکردبوو. بەدرێژایی ژیانی بە ئەسپایی گوێی بۆ خورپە بوونییەکان، دیدەکان، دڵەڕاوکێکان هەڵدەخست، تەنانەت گوێی بۆ تورەبوون و لوتبەرزیش شلدەکرد، بەکورتییەکەی هەموو لایەنە جیاوازەکانی کۆکردەوە و مەعریفەیەکی فەلسەفی پێ سازدا؛ مەعریفەیەک کە هاوکات لەوە دەچێت کە هەم ڕاستبێت و هەم زیادەڕۆیشبێت، هەم گەورەبێت و هەم بچکۆلەش. ژیانی نیتشە بەڕواڵەت لە ژیانێکی پڕ ئازار و میحنەت دەچێت. وەک منداڵێکی بەهرەمەند ژیانی دەستپێکرد و هێشتام تەمەنی 24 ساڵانبوو کە لە فیلۆلۆژی (زمانەوانی) کلاسیکدا پلەی پرۆفیسۆری بەدەستهێنا، بەڵام بەهۆی نەخۆشیەوە ناچاربوو لەپێش وەختدا خانەنشینبێت. نەخۆشییەکەی هەرگیز لێی نەبووەوە و لە دواجاردا شێتیکرد (نیتشە ناسەکان تا ئێستاکەش مشتومڕ لەسەر هەردوو لایەنەکە دەکەن؛ نەخۆشیەکەی و شێتبوونەکەی). دوابەدوای خانە نشینییەکەی چەند سەفەرێکی بەملاولادا کرد؛ لە هەندێکیاندا هەستی بە دڵشادی و گەشبینی دەکرد و لە هەندێکی تریشیاندا بە ماتەمینییەکی قووڵ. فەلسەفەی نیتشە بەبێ هیچ کاریگەرییەکی مەزنی دەرەکی سەریهەڵدا. ئەمەش هێزێکی تایبەتی پێدەبەخشێ کە بەلای خۆیدا ڕاتدەکێشێت، ڕاست ودروست ڕەنگی ناواخنی ئەزموونێک دەردەکەوێت کە لە ناو لێکۆڵینەوە فەلسەفییە ئەکادیمییەکاندا نایبینین. نیتشە ئاستێکی بەرز بۆ بیرکردنەوەکانی هەڵدەبژێرێت و هێدی هێدی قووڵدەبێتەوە و بەبێ ترس خۆی دەردەخات. ئەو بیرکردنەوەکانی گردەدات و دەیکاتە شتێکی ڕادیکال و دژە مرۆیی، هەرچەندە خۆی لە ژیانی تایبەتیدا کەسێکی دوورەپەرێز و سادە و میهرەبان بوو، بەڵێ، لە ڕاستیدا زۆرجاران کەسێکی شەرمنیش بوو. بەم شێوەیەش، لە ڕێگەی هەموو ئەو شتانەی کە خۆی نەیدەتوانی وەک ئەوانبێت، بیرۆکەی "باڵامرۆ"ی لەلا لەدایکبوو؛ هەڵبەتە باڵامرۆ هیچ شتێک کاریگەری تێناکات و لە جیهانی داهاتوودا دەسەڵات بەدەستەوە دەگرێت. نیتشە خۆی لە "ئیرادەی هێز"دا مەستدەکات و زۆر بەڕاشکاوی باسی خۆشەویستترین بیرۆکەی خۆی دەکات؛ "گەڕانەوەی هەتاهەتای شتەکان"، نیتشەی نووسەر لەکاتی باسکردنی بیرۆکەکەیدا، بەشێوەیەکی یەکجار بڵاو خۆی نیشاندەدات؛ "ئایا دەزانن جیهان بەلای

منەوە چییە؟ لە ئاوێنەی خۆمەوە جیهانتان نیشان بدەم؟ ئەم جیهانە؛ هێزێکی یەکجار مەزنە، نە زیاتر دەبێت و نە کەمتر، هەرگیز تەواوبوونی نییە، تەنها جێگۆڕکێ دەکات، بە شێوەیەکی گشتی شتێکی گەورەی نەگۆڕە، ماڵدارییەکە نە مەسرەفی هەیە و نە زەرەر، بەڵام لە بەرابەریشدا نە پەرەدەسێنێت و نە هیچ داهاتێکیشی هەیە، "هیچێتی" ئابڵوقەی داوە و سنووری نەخشاندووە، هیچ شتێکی لێ نارژێت، هیچ شتێکی لێ ناڕواتە دەرەوە، بەڵکو وەک هێزێکی دیاریکراو لە بۆشاییەکی دیاریکراودا دانراوە... وەک دەریایەکی پڕ لە هەڵچوون و تەوژمی هێز، نەمر، هەمیشە جێگۆڕکێ دەکات و بەپەلە دەگەڕێتەوە ناوخۆی، لە ڕێگەی چەندەها ساڵی گەڕانەوەدا، لە ڕێگەی داکشان و کشانی ئاوەکەیەوە، هەوڵدەدات لە سادەییەوە دەرچێت و بەرەو هەمەڕەنگی بڕوات، لە هێمنترین و گیرترین و ساردترینەوە دەڕواتە ناو گەرموگوڕترین و بەرزترین بەرپەرچدانەوەی دژ بە خۆی ،ئەوجا دیسانەوە دەگەڕێتەوە جێگەی خۆی، لە لێشاوەوە بۆ سادەیی، لە یاریکردن بە بەرپەچدانەوەی خۆیەوە بۆ خواستێکی تەبا، دان بە ڕەوت و یەکبوونی ساڵەکاندا دەنێت، خۆی پیرۆزدەکات، وەک شتێک کە دەبێت بۆ هەتاهەتایە دیسانەوە بگەڕێتەوە..."

(فەیلەسوفێکی گرنگی تر کە لە سەدەی بیستدا ڕۆڵێکی مەزنی هەبوو، "فریدریک نیتشە"ی فەیلەسوفی ئەڵمانی بوو... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 487)

**Newton، Isaac نیوتن، ئیساک**

بەرنامەی ئەم ڕووناکبیرە گەردوونیە مەزنە لە هەموو پێوانکارییە نەفرەت لێکراوەکان ئاشکراتربوو، نیوتن بەرامبەر خەڵکانی سەردەمەکەی خۆی (کەزۆربە کات گومانێکی گەورەیان دەربارەی بیروڕاکانیان هەبوو) وەستا و گوتی؛ "پلانی من ئەوەیە کە لەڕێگەی بەڵگەی وورد و دروستەوە گەشە بە زانستی سروشتبدەم". نیوتن "1642 تا 1727" بۆ جێبەجێکردنی ئەم پرۆگرامەی پشتی بەو پرێنسیپە ئەقڵییانە نەدەبەست کە سەربەستن لە ئەزموونەکان (وەک خۆی دەیگوت "من هیچ جۆرە گریمانەکارییەک داناهێنم"!). پرۆسەی توێژینەوەو تاقیکردنەوە بەسن بۆ ئەوەی پڕاوپڕ بمانگەێننە ئەو ئەنجامانەی کە هەوڵی بەدەست هێنانیان دەدەین. پاشان کەمتر پشت بە تیۆری دەبەستین (تەنها ئەو کاتە پێویستیمان بە تیۆریە، کە هەقیقەتمان لا وونبێت) و لەبری ئەوە زیاتر پسپۆڕانە لەو مادەیە وردەبینەوە کە لێیدەکۆڵینەوە. نیوتن لەڕێگەی چەند ئاکامێکی مەعریفیی گرنگەوە زانستە سروشتییەکانی دەوڵەمەندترکرد؛ بنچینەی تیۆری میکانیکی دامەزراند، یاسای هێزی ڕاکێشانی داڕشت و کۆمەکێکی گرنگی لەبواری بینین سازیدا (*ئەو لایەنەی زانستی فیزیا کە دەربارەی خاسیەتەکانی ڕووناکی و ئامێرەکانی بینینە.و) پێشکەشکرد. حسابی تەواوکاری داهێنا (لە هەمان کاتی داهێنانەکەی لایبنیزدا بوو، هەر لەبەر ئەم هۆیە مافی داهێنانەکەی لەلایەن قوتابیانی هەردووکیانەوە مشتومڕێکی زۆری لەسەرکرا). هەرچی دەربارەی تیۆری ڕووناکییەکەشیەتی، گۆتەی نووسەری تووڕەکرد، چونکە گۆتە گەشەی بە "تیۆری ڕەنگەکانی" تایبەت بەخۆی کردبوو و پێی وابوو "لەو کارە نیوتنییە" زۆر زیرەکترانە و ڕاستتریش بێت.

(بەڵێ، پاشان نیوتن هات و ئەو یاسایەی دارِشت، کە پێی دەڵێین "هێزی راکێشانی گەردوونی"... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 223*، 234، 246، 334، 336)

**Nihilism نیهیلیزم**

زاراوەکە لە ووشەی "نیهیل"ی لاتینییەوە هاتووە و مانای "هیچ" دەبەخشێت، وە وەسفکردنی جۆرە جیهانبینییەک دەگرێتەوە کە مرۆڤ (چیتر) لە ڕاستیدا ناتوانێت شتەکان هەڵسەنگێنێت. کەسێکی نیهیلیست بە شێوەیەکی هەمیشەیی ماندووە، چونکە هەموو شتێکی دۆزیوەتەوە، لە هەموو شتێک تێگەیشتووە و لەو ڕوانگەیەوە تەنها یەک ئاکام دەدات بەدەستەوە؛ ژیان ئەوە ناهێنێت خۆتی بۆ بێزار بکەیت، چونکە هەموو چاوەڕوانکردنە مەزنەکان، هەموو ئومێدە گەورەکان و هەموو خەونەکان لە مێژەوە لە ئاسۆی ژیاندا دیارنەماون، ئێستاکەش، هەروەک پێشووتر، تەنها یەک شت لە ئاسۆی ژیاندا بەدیدەکرێت؛ کتومت هیچێتی. جەیکۆبی "1743 تا 1819" ی فەیلەسوفی ئەڵمانی زاراوەی نیهیلیزمی هێنایە ناو فەلسەفەوە، هەڵبەتە وەک ڕەخنەیەک بەرامبەر فیختەی هاوەڵی بەکاریهێنا. دواتریش زاراوەکە لە ڕێگەی ڕۆمانی "باوکان و کوڕان"ی "تۆرگینی" نووسەری ڕوسیەوە زیاتر ناسرا. نیتشە ئاماژەی بۆ یەکێک لە هاندەرەکانی بیرکردنەوەی نیهیلیستی کردووە ـ مرۆڤ هەستدەکات کە مانای خۆی وونکردووە؛ "لە سەردەمی "کۆپەرنیکۆس"ەوە لەوەدەچێت مرۆڤ هاتبێتە سەر ڕوویەکی لار، ـ بەردەوام خێراتر و خێراتر لە چەق دوردەکەوێتەوە ـ بەرەو کوێ دەڕوات؟ بەرەو هیچێتی؟ بەرەو پەیبردن بە هەستی هیچێتی خودی خۆی؟"

(هەرچەندە سارتەر دووپاتیدەکاتەوە کە ژیان خۆی لە خۆیدا هیچ مانایەکی نیە، بەڵام ئەم شێوە بیرکردنەوەیەی مانای ئەوە نابەخشێت کە وا هەستکات پێنج و حەوت وەک یەک بن. ئەو یەکێک نیە لەوانەی کە پێیان دەگوترێت "نیهیلیست". جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 491)

**Heidegger، Martin هایدیگەر، مارتین**

تاسەردەمی ئێستاکەشمان هایدیگەر "1889 بۆ 1976" بە یەکێک لەو بیرمەندانە دادەنرێت کە گەورەترین ناتەبایی لەسەرە. ئەم ناتەباییەش بەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هایدیگەر تێکەڵی سۆشیالیزمە نەتەوەییەکانبوو، وە دواتریش نەیتوانی بەرامبەر بە خەڵکانی سەرسوڕماو لەو کارەی، هیچ ووشەیەک بدۆزێتەوە و پاکانەی ئەو هەڵەیەی پێبکات. بەڵام دەبێت بڵێین کە ناوبانگی هایدیگەر بەم بۆنەیەوە هیچ زیانێکی لێنەکەوت، بەڵکو ئەم شان بەشانی کانت و نیتشە بەناوبانگترین فەیلەسوفی ئەڵمانی جیهانییە. ناوبانگی هایدیگەر لەجیهاندا یەکجار گەورەترە وەک لە ناو ئەڵمانیادا. هایدیگەر لەسەرەتادا سەرقاڵی توێژینەوەی هەستی بوونی مرۆڤایەتیبوو لە نێوان مردن و دڵەڕاوکێی ژیاندا، لە نێوان پەستی و نیگەرانیدا، بەڵام لە ناواخنی فەلسەفەی دواتریدا ئاماژە بۆ "لەیادکردنی" بووندەکات لەلای مرۆڤایەتی و لێرەشەوە خاڵێکی هێندە گرنگ دەخاتە بەرچاو کە بەڕاستی شایانی بیرلێکردنەوەیە. هایدیگەر لەوەڵامیدا سەبارەت بە ماهییەتی هەقیقەت و شوێنی هەقیقەت، دێت و جیهانی جادووی خۆیی

دەشکێنێت، لە سەرچاوە و لە شتە "سروشتییەکان"ەوە نزیکدەبێتەوە. ئەم نزیکەی هەموو ژیانی لەناو سروشتێکی جوانی دەرەوەی پایتەختدا ژیا، وەک ئامۆژگاریکەرێک هاتە پێشەوە و ڕەخنەی لە مرۆڤ دەگرت کە سروشتی دەرەتاندەوە؛ "ئێستاکە لەوەدەچێت جیهان بووبێتە شتێک کە بیرکردنەوەی ماتماتیکی و ژمارەسازی بتوانن بەراشکاوی دەستی تێوەربدەن. سروشت بووە بە شێوە بەنزینخانەیەکی مەزن، بووە بە سەرچاوەی ووزەیەک بۆ تەکنیک و پیشەسازی مۆدێرن، بەڵام ئەو سەرچاوانە لەمێژەوە بەدەر لە ویست و بڕیاری مرۆڤ بوونیان هەبووە."

(فەیلەسوفێکی بوونگەری "ئێگزیستێنشیالیزمی" تری ئەڵمانی کە لەلایەن نیتشە و کیاگەگۆوە کاریگەری لەسەربوو، مارتین هایدیگەر بوو... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 487)

**Hobbes، Thomas هۆبیس، تۆماس**

هۆبیس "1588 بۆ 1679" لە بارودۆخێکی هێمندا هاتە ژیانەوە، بەڵام بیرمەندێک نەبوو کە بە دڵی هەمووان بێت. هۆی ئەمەش ڕاستەوخۆ دەگەڕێتەوە بۆ بیروبۆچوونی، ئەم هەمیشە چاوەڕوانی هەموو جۆرە خراپەکارییەکبوو لە مرۆڤایەتی؛ بۆ نمونە لە یەکێک لە وتەکانیدا دەڵێت "مرۆڤ بەرامبەر بەیەکتری وەک گورگن"، هەر ڕێک ئەم ڕستەیەش دواتر بووبە بەناوبانگترین وتەی هۆبیس. لە ڕاستیدا هۆبیس نەیدەویست تەنها تیۆریەک سەبارەت بە کۆمەڵگا بدۆزێتەوە، بەڵکو زیاتری دەخواست. دەیویست بەبەرنامەڕێژییەوە ناونووسێکی هەموو جۆرە کێشەیەک دابمەزرێنێت، وە لەو بڕوایەدابوو کە لە ڕێگەی میتۆدی ماتماتیکییەوە بتوانێت لیستەیەک دەربارەی ناواخنی هەموو کێشەکان داڕێژێت. لەو ژمارەسازیانەدا مرۆڤی لە ئەندازەی چەند ژمارەیەکدا قەتیس دەکرد، ئەمەش بەلای هۆبیسەوە شتێکی ئاسایی بوو. هەرچەندە ئەم بیرمەندە بیروڕای خراپی بەرامبەر مرۆڤ هەبوو، بەڵام لەگەڵئەوەشدا مرۆڤی وەک تاکەکەس دەبینی، وەک بوونەوەرێکی تاک دەیبینی و پێیوابوو سەربەخۆیی و ئازادی تاکە کەسەکان ڕۆڵێکی گرنگ لە کۆمەڵگایەکی سەرکەوتوودا ببینێت (واتە لەلایەکەوە دابینکردنی مافی تاکە کەس و لەلایەکی تریشەوە هەڵکردن لەگەڵ یەکتریدا). هەروەها دەیگوت ئەرکی سەرشانی دەوڵەتە کە جۆرە هاوسەنگییەکی وەها لەنێوان خۆپەرستی و سەربەخۆیی تاکەکەسەکاندا بهێنێتەکایەوە کە کۆمەڵگا بتوانێت بەشێوەیەکی باش بەڕێوەبچێت ـ ئەمەش ئەرکێکە کە تەنها لەسەر دەستی وڵاتێکی لەڕادەبەدەر بەهێزی وەک "لیڤیاتان"ەوە (*شێوە وڵاتێکی دیکتاتۆرییە.و) بەدیدەهێنرێت، (واتە گەورەترین هێزی مرۆیی کە لە پێکەوەگرێدانی هێزی چەندین مرۆڤەوە پێکهاتووە).

(نمونەی هەڵگری فیکرەی مەتریالیزمیش لە سەدەی حەڤدەدا زۆربوون، لەوانەیە کاریگەرترینیان تۆماس هۆبیسی فەیلەسوفی ئینگلیزی بێت... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 246)

**Homer هۆمیر**

بۆ ئەوەی تیشک بخەینە سەر ژیانی هۆمیری نووسەر، پێویستیمان بە شارەزاییەکی فراوان هەیە، چونکە هۆمیر تەنانەت زمان ناسەکانیش ڕووبەڕوی ئالۆزی و مەتەڵێکی

بەردەوام دەکاتەوە. بەپێی سەرچاوەکان ئەم لە سەدەی هەشتی پێش مەسیحدا ژیاوە، وە لە سەردەمی کۆندا بە نووسەری هەر دوو داستانە گەورەکەی "ئیلیادە" و "ئۆدیسە" دادەنرا، بەڵام ئەمڕۆکە بە چاوی گومانەوە تەماشای ئەمە دەکرێت. ئێستاکە تیۆرییەک لە ئارادایە کە دەڵێت مێژوو تەنها خاوەنی یەک هۆمیر نەبووە، بەڵکو زنجیرەیەک لە "هۆمیرەکان" هەبوون. فەیلەسوفەکان لەلایەکەوە ڕەخنەیان لە خواکانی هۆمیر دەگرت و دەیانگوت خواکانی لەڕادەبەدەر لە مرۆڤ دەچن، بەڵام لەلایەکی تریشەوە سەرسامی بوون، بۆ نمونە ئەریستۆتالیس دەگوت "هۆمیر نووسەرێکی کەم وێنەیە و خاوەنی ڕەوشێکی نایابە". جولیان جەینسی دەروونناس و توێژەری ئاگایی ئەمریکی، لێکۆڵینەوەیەکی سەرنجراکێشەری بە ناوی هۆمیرەوە گرێداوەتەوە؛ لە باسەکەیدا دەڵێت داستانەکانی هۆمیر دەکومێنتێکی نمونەیی سەردەمێکمان نیشاندەدات کە هەموو چالاکییە جیاوازەکانی مرۆڤ ڕاستەوخۆ بەبێ "ئاگایی خود" ئەنجامدەدران.

(فەیلەسوفە سەرەتاییەکانی یۆنان ڕەخنەیان لە وانە خواییەکانی هۆمیر دەگرت، لەبەرئەوەی خواکان هەم تاڕادەیەکی زۆر لە مرۆڤ دەچوون و هەم وەکو مرۆڤیش جێگەی باوەڕنەبوون... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 37)

### هیپۆکراتس Hippocrates

هیپۆکراتس "نزیکەی 460 بۆ 370 ی پێش مەسیح" پزیشکێکی یۆنانی کۆن و پیاوێکی پڕ لە نهێنی بوو، ئەم بوو کە بنەمای ئاکاری زانستی پزیشکی دامەزراند. زانیارییەکی زۆرمان لەسەر ژیان و بەسەرهاتەکانی ژیانی ئەممان بۆ نەماوەتەوە، بەڵام لەبەرابەردا چەند گوتارێکمان بۆ ماوەتەوە کە باسی ئەم دەکەن؛ لەو گوتارانەدا دەڵێن ئەم پیاوە خاوەنی هزرێکی فرەلایەن و مەزن بووە، شارەزایی لە نەشتەری و ئەناتۆمی و زانستی خاسیەت و کاریگەرێتی دەرماندا هەبووە، هەروەها لە بواری تەندروستی گشتیشدا دەستێکی باڵای هەبووە. هیپۆکراتس وەک پزیشکێک لەو بڕوایەدابوو کە تا ڕادەیەک بتوانین هۆکارە سروشتییەکانی نەخۆشییەک بدۆزینەوە و لێرەشەوە پێی وابوو بتوانین ئاکامێکی گشتیی نەخۆشییەکە بخەینەڕوو. وەک فەیلەسوفێکیش دەڵێن چەندین وتە و پەندی بەنرخی دارشتووە، بۆ نمونە وەک ئەم وتانەی کە باس لە ئاڵۆزی ژیاندەکات؛ "ژیان کورتە، هونەر بەرواڵایە" یان دەڵێت؛ ساتە لەبارەکان خێرا تێدەپەڕن؛ یان لە شوێنێکی تردا دەڵێت؛ ئەزمونەکان هەڵخڵەتێنەرن و هەڵبژاردنی بڕیارەکانیش سەختە."

(هیپۆکراتس لە ساڵی 460 ی پێش زایندا لە دوورگەی کیۆسدا لەدایکبوو، ئەم بوو کە بەردی بناغەی زانستی پزیشکی یۆنانی دامەزراند. جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 65)

### هیراکلیتس Heraclitus

هیراکلیتس "نزیکەی 540 بۆ 480 ی پێش مەسیح" یەکێکە لەو فەیلەسوفە یۆنانییانەی کە زانیارییەکی کەممان دەربارەی هەیە بەڵام لەبەرامبەردا نوکتەیەکی زۆری لەسەر هەیە. لەوانەیە ئەمەش بەپلەی یەکەم بگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستییەی کە هیراکلیتس

مرۆڤێکی داخراو بووە، هەر لەبەر ئەم هۆیەش مێژوو نووسەکان ناچاربوون لە فەنتاسیای خۆیانەوە گوزارشتی لێبکەن. هۆی دووهەمیشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە سەرجەمی نووسینەکانی تەنها هەشتا پارچەی پچڕپچڕی ماوەتەوە و ئەوانەش باس لە حیکمەتێکی هێندە ئاڵۆز دەکەن کە سەختە هیچ کەسێک هەبێت لێیانتێبگات. ئەم فەیلەسوفە، وەک دەڵێن، لە خێزانێکی پاشایانەی شاری ئیفیسۆسەوە هاتۆتە دونیاوە، بەڵام هەر زوو دەستی لەو ژیانە هەڵگرتووە و لەبری ئەوە کەوتۆتە دوای دۆزینەوەی هەقیقەت، دواتریش بۆی دەرکەوتووە کە گەڕان بەدوای هەقیقەتدا لە هیچ لایەنێکەوە خۆشی نابەخشێت، وە ئەگەر بڕوا بەو وتانە بکەین کە لە زاری خەڵکانی سەردەمیەوە دەربارەی ئەم دەگوتران، ئەوا دەتوانین بڵێین کە هیراکلیتس دۆزەرەوەی ڕاستەقینەی حاڵەتی "خەمۆکی دەروونییە". مرۆڤەکانی دی بەهیچ جۆرێک سەرنجی ئەمی ڕانەدەکێشا، بەڵکو لەڕاستیدا تەنها چاوەڕوانی دڵڕەقی و شەڕی لێدەکردن. هەرچەندە هیراکلیتس لەژیانی ئەروستوکراتی دورکەوتبووەوە، بەڵام لەگەڵئەوەشدا بۆی سانا نەبوو بەتەواوەتی دەستبەرداری ببێت؛ ئەم ڕاستییەشمان لە ڕێگەی فەلسەفەکەیەوە بۆدەردەکەوێت کە جۆرێک لە لوتبەرزی و فەرمانکردن و توندی پێوە دیارە، بۆ وێنە لەو حاڵەتانەدا کە گوماندەکات، بیروڕای نەگۆڕ و چەسپاو هەڵدەڕێژێت و لە ئەندێشەی قوڵی مام ناوەندی دوردەکەوێتەوە. ئەم، بە پێچەوانەی پارمێندیسی هاوەڵییەوە، کە نکۆڵی لە هەموو جۆرە جوڵەیەک دەکرد، دەیگوت "هەموو شتێک لە بزاوتندایە" و وەک مادەی هەرە بنەڕەتی جیهانیش ئاگری هەڵبژارد، چونکە بەبڕوای ئەم نەمرە و توانای خوڵقاندنی تێدایە، وەهەروەها هەموو شتێکیش دەگرێتەوە؛ هەر لە شتە گەورەکانەوە (ئاسمان و خاک و دەریا) هەتاوەکو شتە بچکۆلەکانیش (واتە پێکهاتەی هەرە بنەڕەتی ڕۆح). وەکی تریش هیراکلیتس بە شێوەیەکی نایاب لێکدژەکانی دەخستەڕوو وە بەپێی بڕوای ئەم، هێزی بنەڕەتی گەشەکردنی هەقیقەتە. ئەم بیرۆکەیەش سروشی بە چەندین فەیلەسوفی تر بەخشی، بۆ نمونە هیگڵ و نیتشە و چەندەهای تریش. شەڕ لە فەلسەفەی هیراکلیتسدا جێگایەکی فراوان و گرنگ داگیردەکات، ئەمەش لایەنێکی تری فەرمان بەخشین و توندی فەلسەفەکەیمان بۆ دەخاتەڕوو؛ هیراکلیتس دەیگوت "شەڕ بابە گەورەی هەموو شتێکە"، یان دەیگوت "شەڕ شتێکی ئاساییە". هەرچی دەربارەی ئاکامەکانی شەڕیشە، زۆر بە پوخت و کورتی دەیگوت؛ "شەڕ لایەنێک دەکاتە خودا و لایەنێکی تر دەکاتە مرۆڤ، هەندێ کەس دەکاتە کۆیلە و هەندێکی تر ئازاددەکات". لەڕوانگەی هیراکلیتسەوە لەگەڵ هەموو شتە چەوت و بێماناکاندا جۆرە یاسایەکی گەردوونیش بوونی هەیە، ئەو ناوی ئەو یاسایەی نابوو "لۆگۆس". زاراوەی لۆگۆس لە بنەڕەتدا مانای "وتەی بەمانا" یان "هزر" دەبەخشێت، بەڵام لەلای هیراکلیتس هێزێکی نایاب و بێوێنە دەگرێتەوە کە خۆی پەی پێدەبات و "زۆربەی خەڵکی" لێی تێناگات. پڕنهێنی بیرکردنەوەکانی هیراکلیتس سروشی بە چەندەها نووسەر بەخشیوە؛ بۆ نمونە وتەی وەک "لەو شەودا کە مرۆڤێک دەمرێت مۆمێک بۆ خۆی دادەگیرسێنێت، بەڵام لەڕاستیدا هێشتام هەر دەژی"، یان "ڕێگای بەرەوسەر و ڕێگای بەرەوخوار یەک ڕێگایە و هەمان شتیشە"، وێنەی نایابی ئەندێشەی قووڵ و پڕلەنهێنی ئەم فەیلەسوفەمان بۆ دەخاتەڕوو.

(هیراکلیتس لە هەمان سەردەمی پارمێنیدسدا دەژیا ... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 45*، 56، 142، 145، 389)

**Herodot هیرۆدۆت**

سیسیرۆ ناوی "باوکی مێژوو"ی لێنابوو. هیرۆدۆت (نزیکەی 484 تا نزیکەی 424 ی پێش مەسیح) بە پێچەوانەی سیۆسایدیدسی هاوەڵیەوە مێژوو نووسێک بوو کە کەم جار ڕێدەکەوت لە باسە فرەلایەنەکان لابدات. ئەم دەهات و باسی مۆراڵی بۆ خوێنەرەکانی دەکرد؛ مۆراڵێک کە تەنها ئەو کاتە کاریگەرە کە بکرێتە پێوانەیەکی هەڵسەنگاندن، وە بەبڕوای ئەم پەیبردن بەو پێوانەیە گرنگە، بەتایبەتیش گەر بمانەوێت لە ژیاندا سەرکەوتوبین. هیرۆدۆت لە ڕێگەی باسە "مێژووییەکانیەوە" نمونەی تێنەگەیشتن لەو پێوانەیە دەهێنێتەوە و باسی کەسایەتییە بەدەسەلاتەکان دەکات کە خۆیان لە شوێنی خوادا دادەنێن و لەدواجاردا دەبنە پەککەوتە و بێدەسەلات. ئەو دەیگوت "ئەرکی سەرشانی مێژوونووسە کە باس لەو سەرکەوتن و دۆڕاندنانە بکات کە دەکرێت ببنە نمونەی بەسوود، بەو شێوەیەش ئەو مرۆڤانەی کە دواتر دێنە دونیاوە بەئاگا دەبن لە هەموو ئەو شتانەی کاتی خۆی بەسەر مرۆڤایەتیدا هاتووە."

(بەناوبانگترین مێژوونووسی یۆنانیش هیرۆدۆت و سیۆسایدیدس بوون... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 64)

**Hegel، Georg Friedrich هیگڵ، جۆرج فریدریک**

هیگڵ (1770 تا 1831) وەک منداڵێکی ئاسایی گەشەی نەکرد، بەڵکو نەشونمای منداڵی کەمێک دواکەوت. باوکی کارمەندی دەوڵەت بووە و سێ منداڵی هەبووە، هیگڵ گەورەترینیان بوو. ئەم پلەوپایەی گەورەیی و پیرییەی هیگڵیش بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەگەڵیدا مایەوە؛ لەو سالانەدا کە تیۆلۆژی دەخوێند، بووە برادەری شێللینگ و هۆیلدەرلین، ئەمانیش نازناوی "باپیر"یان لێنا. دواتریش کە لە فەلسەفەدا پلەی پرۆفیسۆری بەدەستهێنا، زۆرینەی هاوەڵەکانی لە خۆی زۆر گەنجتربوون. هیگڵ بەردەوام لە ڕێگەی چالاکییەکانیەوە ئەو جیاوازییەی پارسەنگ دەدایەوە، هەرچەندە زۆر جار بەرامبەرەکانی هێز و توانای ئەمیان کەم دەنرخاند. پاشئەوەی خوێندنی تەواوکرد، لەشاری بەرلین و فرانکفۆرتدا بووە مامۆستای مالان، دواتریش پلەوپایەی بەرزبووەوە و بەپێی پێشنیارێکی شێللینگ (کە پێنج ساڵ لەو گەنجتربوو) لە شاری جینادا بووە پرۆفیسۆر، بەلام بارودۆخی ڕامیاریی ناچاریکرد هەم شوێنی ژیانی و هەم پیشەکەشی بگۆڕێت؛ لە پێشدا بووە سەرنووسەری "بامبێرگەر زایتونگ"، ئەوجا وەک سەرۆکی کۆلیج لەشاری نیورنبێرگدا دامەزرا، لێرەوە دەرگای بەناوبانگبوونی لەسەر ئاواڵە بوو. لەساڵی 1816 دا لەشاری هایدلبێرگدا بووە پرۆفیسۆری فەلسەفە و بۆ ماوەی دوو ساڵ وانەی گوتەوە، هەموو ئەو کاتە زیادەیەش کە لەبەردەستیدابوو لە شاری بەرلیندا وەک فەیلەسوفێکی بەناوبانگ بەسەریدەبرد. وانەکانی هەرزوو بوونە مایەی سەرنجی چواردەورەکەی، هەرچەندە لەڕاستیدا گوتاربێژێکی مەزن نەبوو ("هیگڵ نە بەشێوەیەکی ئاسایی قسەی دەکرد وە نە بەڕەوانیش؛ دەنگێکی قرخنی هەبوو و زۆرینەی ووشەکانیشی بەدەنگێکی نووساو هەڵدەڕشت، زوو زوو قوڕگی پاکدەکردەوە و دەکۆکی، هەمیشەش ووشەکانی ڕاستدەکردەوە..."). لەو کاتەدا نەخۆشی کۆلێرا لەبەرلیندا بلاوبووبووەوە و هیگڵیش هەر بەهەمان نەخۆشی مرد. لەگەڵ مردنیدا چیتر وەک پیرترین کەس تەماشا

نەدەکرا، بەڵکو وەک بەناوبانگترین کەسی بروسی دەبینرا کە گیانی لەدەستدابێت. هیگڵ شێوە سیستمێکی ڕێکخستنی هێنایە ناو فەلسەفەوە. ئەم سیستیمەش شتێک بوو کە کانت لەوەوبەر ئاشنایی لەگەڵدابوو، بەڵام هیگڵ بەتەواوەتی بەرنامەڕێژیکرد و ڕێکیخست. شایانی باسە بڵێین تەنها یەک فەیلەسوفی ئەڵمانی، فەیلەسوفێکی بوێری چاونەترسی وەک ئەم دەیوێرا بەکارێکی ئاوها هەستێت. لە ڕاستیدا هەر شێوازی بیرکردنەوەکەی هیگڵ خۆی لە خۆیدا ترسناکە و بە شێوە تێڕوانینێکی قووڵ پەردەپۆشکراوە؛ ئەم لە بنەڕەتدا دەیویست بیر لەو ئەندێشانە بکاتەوە کە خودا لەپێش خولقاندندا لە خەیاڵیدابووە. ئەو جۆرە ئەندێشانە لە ناواخنی سیستمەکەیدا پێناسەی باڵاترین شێوەی ئەقڵانیەت دەخەنەڕوو، وە هەروەها پرۆسیسی خۆناسینەوە نیشاندەدەن کە هێزی بزوێنەری سەرەکی دەگەڕێنێتەوە بۆ "ڕۆح"، ڕۆحێک کە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر ئاگایی هەیە. ڕۆح، سەبارەت بە ژیان، چەندەها بیرۆکەی هەمەچەشنە لە مێشکدا دەخولقێنێت، بەڵام هیگڵ لاکەی تری ئەم بابەتەش، واتە شتە بابەتییەکان یان هەقیقەت، بەتەواوەتی دەخاتە ڕوو. بۆئەوەی هەقیقەت بتوانێت لەخۆی بگات، پێویستیی بە مەعریفەیەکی بەئاگا هەیە؛ تەنها هەقیقەتی بەئاگا دەتوانێت ببێتە هەقیقیتێکی "ئەقڵانی". هیگڵی پسپۆڕ لە دیالێکتیکدا مامۆستایانە یاری بە لێکدژەکان دەکرد، ئەو لێکدژانەی کە بەپێی ڕێنامە و پلان دەیهێنایە ناو پرۆسیسێکی بیرکردنەوەی وەهاوە کە سەرجەمی شتەکانی پێ پێناسەدەکرد و دیاریدەکردن؛ بۆ نمونە ڕۆحی خۆیی و ڕۆحی بابەتی، ئاگایی تاکایەتیی و ئاگایی سەروتاکایەتی تێکەڵ بەیەکدی دەبن. تاکە کەس تەنها بەشێکی بچکۆلەی مێژووی مەزنی جیهان پێکدەهێنێت، چالاکییە گەورەکانی ڕۆحیش لە سەرەتای کاتەوە تا کۆتایی پرۆسیسی خولقاندن دەگرێتەوە. تاکە کەس لە چەند هەڵگرێکی پرینسیپی ئاگایی دیاریکراو زیاتر هیچیتر نییە. لێرەشەوە، واتە لە ڕێگەی چەندەها پرینسیپی تری ئاگایی بچکۆلەی ترەوە، دەتوانێت نرخی خۆی هەڵبسەنگێنێت. بەلای هیگڵەوە هەستی تاکە کەسێک بەرامبەر بە بوونی کەسایەتی خۆی، هەستکردن بە خۆشبەختی و ئاسوودەیی خۆی شتێکی گرنگ نیە و لەم بارەیەوە دەڵێت؛ "مێژووی جیهان زەمینەیەکی بەپیتی ئاسوودەیی نییە، ماوە ئاسوودەییەکانی مێژووی جیهان چەند لاپەڕەیەکی بەتاڵن..". تێکەڵەی ڕاستگۆیی لەڕادەبەدەری هیگڵ و بێڕەحمی و دڵڕەقییەکەی هیگڵ، ئەم فەیلەسوفە دەکاتە سەیرترین و گرنگترین فەیلەسوفی مێژووی فەلسەفە. هیچ فەیلەسوفێکی تر ئاوها وەک ئەم سەرسەختانە نەویستووە بیرکردنەوەی خۆی بچەسپێنێت، وە هیچ فەیلەسوفێکی تریشمان نییە کە لە بابەتە هەرە گەورەکانەوە هێندە نزیکبووبێتەوە. دەتوانین بڵێین دوو ڕۆح لە سنگی هیگڵدا دەژیان، وە ئەگەر بێین و باس لەوە بکەین کە هیگڵ شەراب خۆرێکی سەیربووە، ئەوا دەبێت دەربارەی ئەم بابەتە بڵێین؛ لەوانەیە هیگڵ دوو کەس بووبێت لە کەسێکدا ـ لەلایەکەوە کەسێکی ڕۆحانی نمونەیی و لەلایەکی تریشەوە پیاوێکی ئاسایی کە چێژی لە بەناوبانگی خۆی بینیوە، واتە هیگڵێک و هیگڵێک کە بەتوندی پابەندی دیالێکتیکەکەی بوون و ڕێگەی پێداون زۆر بەزیندوویی بەچواردەوریدا بخولێنەوە.. وەکی تریش نووسینەکانی هیگڵ ڕاستەوخۆ هێندە سەرنجڕاکێش نەبوون، بەڵام لەگەڵئەوەشدا دەیتوانی بە ڕاشکاوی خۆی نیشانبدات و ڕاستەوخۆ پەنجە بۆ شتەکان ڕابکێشێت، بۆ نمونە کاتێک کە ئەندێشەیەکی بەم شێوەیە دادەڕشت؛ "گەر پێشئەوەی تێگەیشتنمان

هەبێت و بمانەوێت تێبگەین، ئەوا وەک ئەو حاڵەتە بێمانایە کە بمانەوێت فێری مەلە ببین و نەوێرین بچینە ناو ئاوەوە".

(هیگڵ... ئەو شتەی کە ئەقڵانی بێت، توانای ژیانی تێدایە... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 330،360، *384، 399، 403، 407، 418، 423،487، 489، 515)

### "Hildergard of Bingen هیلدەگارد"ی بینجین

وەک ڕاهیبەیەک لە کڵێسەیەکی تایبەت بەخۆیدا، "هیلدەگارد"ی بینجین "1098 تا 1179" یەکێک بوو لەو ئافرەتە پێشەوا بەدەگمەنانەی سەردەمەکەی خۆی. هیلدەگارد کەسێکی سادە و بێفیزبوو، بەلایەوە ئاسایی بوو نەزانینی بخاتەڕوو، وەک ئافرەتێکی سەردەمەکەی ڕازیبوو بە کەمنرخاندنی بوونی خۆی، بەڵام هەموو ئەمانە ڕێگەیان لێنەگرت کە بەرگری لە بیروڕا تایبەتییەکانی خۆیبکات، وە تاوناتاوێکیش وەک کەسێکی تەواو کەللەڕەق و سەرسەخت خۆی نیشاندەدا. هیلدەگارد توێژەرەوەیەکی بەهرەمەندی سروشتبوو، وە لەسەرو ئەمەشەوە هەم پزیشک و هەم ڕاهیبێکی وتاربێژبوو. بیرکردنەوەکانی پشت بە سروش دەبەستن. ئەم جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە "چیرۆکەکانی" لە "حاڵەتێکی خەواڵو" یان "لە خەوندا" بۆ نەهاتوون، بەڵکو لە حاڵەتێکی بەئاگادا بۆیهاتوون و بە ڕۆحێکی ڕوونبینەوە بەقوڵی هەڵیسەنگاندوون. فەلسەفەی هیلدەگارد گەشبینانە باسی مرۆڤ دەکات، وە بەبڕوای ئەم، گەر خوا بخوازێت، مرۆڤ دەتوانێت لە نهێنیەکانی جیهان و ئاسمان تێبگات.

(بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە هیچ بیرمەندێکی ئافرەت نەبووبێت. یەکێک لەوانە، "هیلدەگارد"ی بینجین بوو... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 199*، 320)

### Hellenism هیللینیزم

هیللینیزم ئەو ماوە مێژووییە دەگرێتەوە کە لە نێوان 323 ی پێش مەسیحدا (ساڵی مردنی ئەلێکساندرای گەورە) و هەتا دوا نیوەی یەکەمین سەدەی پێش مەسیحدایە، ئەو کاتەی یۆنانی کۆن بەرەبەرە هەڵدەوەشایەوە و لەناو ئیمپراتۆری ڕۆمانیدا دەتوایەوە. ڕاستە یۆنانی کۆن بە شێوە دەرەکییەکەی ڕوخا، بەڵام لەبەرامبەردا کەلتوری یۆنانی بڵاوبووەوە و لێرەشەوە خاڵێکیان سەلماند؛ هەرچەندە ووشە و کردار نوێنەری هیچ دەسەڵاتێک و دامودەزگایەکیش نەبن، بەڵام لەگەڵئەوەشدا دەکرێت کاریگەرییەکی گەورەیان هەبێت.

(هیللینیزم... پریشکێک لە ئاگرەکە... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 132)

### Hinduism هیندۆیزم

ئەم ئایینە کەسێکی دامەزرێنەری نییە و زۆرینەی ئەو کەسانەی کە بڕوایان پێیە لە هندستان و پاکستان و بەنگلادشدا نیشتەجێن. هیندۆیزم خۆی بە شتێکی "هەتاهەتایی" لەقەڵمدەدات و بڕوای بە بوونی چەندەها خودا و شەیتان و کەسانی ڕۆحانی هەیە. لەڕوانگەی ئەم ئایینەوە جیهان و ژیانە جۆراوجۆرەکان بە شێوەیەکی هەرەمی

هەڵچنراون، وە لێرەشدا شێوە هەقانییەتێکی باڵا "کارما"(*ووشەیەکی سانسکریتییە، بەکورتی واتە هەموو کارە باش و خراپەکانت ڕۆژێک لە ڕۆژان (یان لە ژیانێکی داهاتووتدا) ڕووبەڕووت دەبێتەوە. و) دەسەڵاتی بەدەستەوەیە؛ واتە، هەرکەسێک بەپێی ئەمەک و چاکەی شاراوەی خۆی، شوێنی تایبەتی بوون و ژیانی وەردەگرێت، لەبەر ئەم هۆیەش نەگلەییکردن هیچ سوودێک دەبەخشێت، وە نە سکاڵاکردنیش. ئەم ئایینە وەک ئاینی بودیزم برِوای بە کۆچکردن و لەدایکبوونەوەی ڕۆح هەیە، وە لە ڕێگەی ئەم برِوایەشەوە باس لە هەقانییەتی ڕژێمی کاست (برِوانە لاپەڕەی 101 ی جیهانی سۆفیا) دەکات.

(جگە لەوەش چەندەها خاڵی هاوبەش لە نێوان ئاینی هیندۆیزم و بودیزم لەلایەک و فەلسەفەی یۆنانی لەلایەکی ترەوە، بەدیدەکەین... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 164)

**هیوم، دەیفید Hume، David**

هیوم "1711 تا 1776" لە سەردەمی منداڵیدا لەباری تەندروستییەوە سست و لاوازبوو، وە لەتەمەنی گەنجێتیشیدا ئەو سیما لاوازەی هەر پێوەدیاربووە. هیوم لە خێزانێکی "کالفینیستی" (*دەگەڕێتەوە بۆ کالفین "1509 تا 1564"، ئەم تیۆلۆژێکی پرۆتستانتی فەڕەنسی بوو، بە برِوای ئەم چارەنووسی مرۆڤ لەپێش لەدایکبوونیەوە دەستنیشانکراوە*.و) ئاینی توندوتیژدا لەدایک بوو. لە خێزانەکەیاندا ئاینێک دەسەڵاتداربوو کە هەمیشە ڕووداوەکانی بەو شێوەیە پەسەنددەکرد کە هەن، تەنانەت لە هۆی بنەڕەتی ڕووداوەکانیشیان نەدەپرسی. لە قوتابخانەی باڵای ئایندبۆرگدا ئاشنایی لەگەڵ کتێبەکان و جیهانی ئەندێشەدا پەیداکرد، هەڵبەتە لە چوارچێوەی ئەو سنوورەی لەو کاتەدا ڕێگەی پێدەدرا، لێرەشەوە کەوتە ناو گومانێکی یەکجار قوڵەوە. دایک وباوک و خزمەکانی بەردەوام فشاریان دەخستە سەر کە زانستی یاسا بخوێنێت وە پاش هەوڵێکی زۆر ڕازیبوو، بەڵام دواتر کەللەڕەقی خۆی نیشاندان و لە بری زانستی یاسا بڕیاریدا فەلسەفە بخوێنێت. ئەم بڕیارە چاونەترسانەشی باجی خۆی هەبوو، لەڕاستیدا نەخۆشکەوت؛ تووشی نەخۆشیەکی سەیری بەدەنی بوو، کە لەوانەیە سەرچاوەکەی بگەڕێتەوە بۆ باری دەروونی، تاو ناتاوێک ئیشتیهای خواردنی نەدەما و لیکێکی زۆر بەدەمیدا دەهاتەخوارەوە و پێستی پەڵەپەڵە دەبوو. بەڵام دواتر ئیشتیهای بەجۆرێک کرایەوە کە سەختبوو ڕێگەی لێبگرێت، لاوازی و سستییەکەشی گۆڕانکاری بەسەرداهات و بووە پیاوێکی گەنجی قەڵەو. هیوم دەستی بەسەفەرکردنکرد؛ بۆ ماوەیەک لە فەرەنسادا نیشتەجێبوو، لە ماڵاندا وانەی فەلسەفەی دەگوتەوە و نانی ژیانی پەیدادەکرد. کاتێکیش گەڕایەوە بۆ بەریتانیا، ڕەشنووسی یەکەمین کتێبی داڕشتبوو. کتێبی لێکۆڵینەوەی "سروشتی مرۆیی"یەکەی هیوم شکستێکی گەورەی هێنا و هەمووان دوورەپەرێزبوون لێی. ڕەخنەیەکی توند و تیژی لێگیرا و دەیانگوت "ئەم پیاوە سکۆتلانییە ناشیرینە" دەبێت بە زووترین کات فەرامۆشبکرێت، چونکە بیرچوونەوەی کەسێکی وەک ئەم ئاساییترین شتە کە بەرامبەری بکرێت. شکاندنی ئەم وێنەیەی لەگەڵ کارەکانی دواتریدا دەستیپێکرد. لەسەرەتادا وەک مێژوونووسێک و زانایەکی ئابوری دانیانپێدانا، دواتریش وەک فەیلەسوفێک، شایانی باسە بڵێین لەو کاتەدا هیوم لە بواری ڕامیاریشدا چالاکبوو؛ سکرتێری باڵوێزخانەی فەڕەنسابوو، وە لە لەندەنیشدا ڕاوێژکاری وەزارەتی دەرەوە بوو.

هیوم لەسەر ئەم کارانەی بەردەوامبوو، بەڵام دواتر توانای نەما و لە شاری ئایدنبۆرگدا نیشتەجێبوو. پاشتریش لە تەمەنی پیریدا بە تاوانی بێخودایی تاوانباریانکرد، بەڵام بەهۆی "ئاکاری بەرز و بەهێزیی کەسایەتییەوە" تاوانەکەیان لەسەرلابرد .

هیوم بە زیرەکترین ئیمپیریستی بەریتانی لەقەڵەم دەدرێت. ئەم، سوورە لەسەرئەوەی کە توانای سەرنجدان و هەڵسەنگاندنی مرۆیی بتوانێت هێندە مۆرکی هەستی و ئەندێشە کۆبکاتەوە کە بەس بێت بۆ ئەوەی بتوانێت مەعریفە و زانینی لەسەر هەڵبچنێت. سەرنجی هەستی، بەردی بناغەی هەموو زانینێکە؛ وە هەروەها پێکهاتەی هەموو ئەو ئەندێشە ئاڵۆزانەی کە مرۆڤ دەتوانێت بیانخوڵقێنێت، پەیوەندییەکی گەورەی بە سەرنجدان و هەڵسەنگاندنە هەستییەکانەوە هەیە. ئەو ئەندێشانە تەنها ئەو کاتە ڕاستن کە لە سەر بنەمایەکی ئیمپیریستیی دیارەوە هەڵچنرابن، وە ئەگەر لەسەر هەر بنەمایەکی تر داڕێژرابن، ئەوا تەنها فەنتاسیان و لێرەشەوە هیچ گرنگییەکیان نییە. خودیش هەروەها؛ خود بەردەوام پێویستی بەوەیە کە زانیاری ڕاست و دروستی بخرێتەسەر، وە ئەگەر خود بەشێوەیەکی ئاوها پڕنەکرێتەوە، ئەوا بەتاڵدەبێت، دەبێتە حاڵەتێکی ئاگایی ئەبستراکت و هەموو چالاکییەکانی لەبازنەی ئەو خووانەدا دەخولێتەوە کە بە درێژایی ژیانی کۆیکردۆتەوە. خود دەبێت بەردەوام زانیاری دەربارەی خۆی و چواردەورەکەی بەدەستبهێنێت. بەهۆی هەبوونی ئاگاییەوە خود ڕۆحێکی پەشێوە، چەقێکی بێئارامی هێزە و "ئارادەیەک لە کۆمەڵێک هەستی جیاواز جیاواز زیاتر، لە هیچ شتێکی تر پێکنەهاتووە؛ ئەو هەستانەش بە خێراییەکی یەکجار زۆری یەک بەدوای یەکدا دێن و بەردەوام لە جوڵەدان". بەڵام ئەگەر خود بە پرۆسەیەکی خووەوە گرێبرێتەوە، ئەوا ئەو کاتە تا ڕادەیەکی یەکجار زۆر پەیوەندی نێوان هۆ و ئەنجام دێتە سەرباس. ئەو پەیوەندییەش هەمیشە خۆی دووبارەدەکاتەوە، بەردەوام خۆی دەسەلمێنێت. لە پرۆسێسێکی هۆیی ئاوهادا، لە ڕێڕەوێکی هۆ و ئەنجامدا، کە شتێکی دیاریکراو هەزار کەڕەت بەهەمان شێوە ڕوودەدات، ڕێیتێدەچێت کەڕەتی هەزار و یەک بە شێوەیەکی تەواو جیاواز ڕووبدات، لەم خاڵەشەوە دەتوانین بڵێین هەموو ئەو یاسایانەی مرۆڤ دەیهێنێتە کایەوە تەنها گریمانەکردنە و بەردەوام دەشێت تاقیبکرێنەوە.

وەکو لایەنی ئاکاریش، هیوم زیاتر متمانەی بە هەستەکان دەکرد وەک لە سەرنجدان و هەڵسەنگاندنی پەتی. باوەڕی بە (چەندە بیرکردنەوەیەکی هەستبزوێنەرە!) شێوە سۆزێک و میهرەبانییەک هەیە کە مرۆڤ پێکەوە دەبەستێتەوە، ("هەستێکی گەرموگوڕ بۆ ئاسوودەیی مرۆڤایەتی و نەفرینێکیش بۆ نەهامەتییەکانی"). لەم جۆرە هەستەشەوە هاوخەمی گەشەدەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ هاریکاری یەکتر بکات، تەنانەت لەو حاڵەتانەشدا کە وادەردەکەوێت یاریدەدانی یەکتری شتێکی باش نەبێت. بەپێی ئەو باسانەی لەبەردەستدان، هیوم کەسێکی بەسۆز و میهرەبان بووە، بەڵکو مرۆڤێکی یەزدانی بووە.. هیوم دەیگوت من دەزانم دوژمنی ڕاستەقینەی فەلسەفە لە کوێدا خۆی حەشارداوە، هەر بەم بۆنەیەوە دەڵێت؛ "هیچ شتێک لە هەڵفڕینی فەنتاسیا مەترسییەکی زیاتر ناخاتە سەر هزر، وە هیچ شتێکیش لەمە زیاتر فەیلەسوفەکانی نەخستۆتە ناو هەڵەی گەورەترەوە"

(هیوم وەک ئیمپیریستێک بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانی، کە هەموو تێگەیشتنێک و بیرکردنەوەیەکی ناڕوونی "فەیلەسوفەکانی" پێشووتری ڕێکبخات.. جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 250، 278*، 285، 296،297، 334، 345، 348، 355، 357،386، 390،495، 500)

### Herder، Johann Gottfried هێردەر، جۆهان گۆتفرید

بەپێی جان پۆڵی نووسەر، هێردەر "1744 بۆ 1803" تەنها ئەستێرەیەکی گەورە نییە، بەڵکو کۆمەڵە ئەستێرەیەکە کە هەموو کەسێک بەپێی پێویستی خۆی دەتوانێت وێنەی تایبەتی ئەستێرەی خۆی تێدا ببینێتەوە. لەڕاستیدا ئەو فەلسەفەیەی هێردەر خوڵقاندی (لە بنەڕەتدا هاردەر تیۆلۆژبوو و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ قەشەی گەورەی شاری پێمەر بوو) لایەنێکی هێندە ئاڵۆز و تووندی لەخۆگرتووە کە بەلای زۆرینەی خەڵکانی چواردەوریەوە (لێرەدا گۆتەش دەگرێتەوە) سەختبوو بەڕوونی لێیتێبگەن. لەسەرو ئەمەشەوە کەسێکی بەدەستور و بەرنامەی مەزن نەبوو، بەڵکو بڕوای بە هەموو چرکەیەکی تایبەتی سروشبەخش دەکرد. لێرەشەوە مایەی سەرسوڕمان نییە کە دەبینین لە مێژووی فەلسەفەکەیدا (ئەمە بوو کەبووە هۆی بەناوباگبوونی) جەخت لەسەر بوونی کەلتوری جیاوازجیاواز و مافی جیاجیای کۆمەڵانی خەڵک دەکات، چونکە لەڕوانگەی ئەمەوە ڕێگەی هەمووان "بەرەو لای خودا" وەک یەک درێژە یان وەک یەک کورتە. هێردەر بەپێچەوانەی جیهان بینینی سەدەی ڕۆشنگەرییەوە، کە سەبارەت بەشتەکان پەیوەستی جۆرە زانینێکی خەیاڵخۆشی دیاریکراوبوون، جەختی لەسەر پێویستی هەڵسەنگاندنی تایبەتی لەمێژوودا دەکرد وە بە بڕوای ئەم کۆمەڵێک نهێنیمان بۆ ماوەتەوە و ناتوانین پەییان پێبەرین. هێردەر زیاتر وەک فەیلەسوفێکی زمان دەرکەوت؛ لە ناو هەموو فەیلەسوفەکانی سەردەمی خۆیدا، ئەم لە هەموویان زیاتر بایەخی بە زمان دەدا، چونکە بەبڕوای ئەم "هزر لەگەڵ سەرهەڵدانی زماندا هاتۆتە بوون."

(ئەو کەسەی لەم بوارەدا لەلای ڕۆمانسیەکان ڕۆڵێکی یەکجار گرنگی بینی، "هێردەر"ی فەیلەسوفی مێژوو بوو... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 374)

### هەقی سروشتی

هەقی سروشتی واتە هەقی ڕەسەن. واتە هەقێکە کە لە ڕێگەی ڕێکەوتن نامە یان دەستور و یاسای ڕەسمی مرۆییەوە بەدەست ناهێنرێت، لێرەشەوە لایەنی گرفتی ئەم بابەتە سەرهەڵدەدات؛ مافێک کە لە خودی سروشتەوە دێت (وەک دەزانین خۆی بەئاگانییە لە هیچ جۆرە مافێک، تەنها ئەوەندە دەزانێت کە بەهێزترین یان باشترین ڕەگەز دەتوانێت خۆی بگونجێنێت) بەپێی پێویستی دەبێت شتێکی نادیار و ناڕوونبێت. مافی سروشتی تاڕادەیەک پەیوەندی بەدەرخستنی ڕەسەنایەتیەوەیە هەیە (کە پشت بە ئەقڵی مرۆڤ دەبەستێت) و گەشبینەکان لەو بڕوایەدان کە هەموومان بتوانین پێی بگەین. هەموو ئەو گرفت و دژوارییانەی کە بەستراونەتەوە بە مافی سروشتەوە، لەناو خودی پێکهاتەی مافی سروشتدایە، وە گرفتەکان ئەو کاتانە ڕوونتر دەردەکەون کە دێین و لەسەر بنەمای مافێکی ئاوها ئاشکرا و گشتی، بڕیاری خۆمان لەسەر بابەتێکی دیاریکراو دەردەکەین، بۆ نمونە لەسەر بابەتێکی وەک سزای لەسێدارەدانی کەسێک؛ ئایا مافی سروشتی سزای لەسێدارەدانی کەسێک بەڕەوادەبینێت؟ ئەم جۆرە پرسیارە، کە ئێستاکەش بەردەوام (لە

ئەمریکادا) قسەی لەسەر دەکریّت، یەکێک بوو لەو پرسیارە مشتومڕ لەسەرکراوانەی لە سەدەی هەڤدەدا سەبارەت بە مافی سروشتی گفتوگۆی لەسەر دەکرا.

(... بۆ نمونە بەبڕوای ئەو چەند یاسایەکی بنچینەیی ڕەوشتی هەیە، کە بەسەر هەمووانداا دەچەسپێت. واتە تەبایە لەگەڵ ئەو شتەی کە پێی دەڵێن هەقی سروشتی... جیهانی سۆفیا، لاپەڕە 282)

چەند دێڕێک دەربارەی نووسەر؛
ئۆتە بیوهمە لەساڵی **1949** دا لە شاری ڕۆتنبۆرگدا لە دایک بووە، زانستی "پۆلیتۆلۆژی" (خوێندنێکە کە تایبەت بە پێکهاتەی ڕامیاری کۆمەڵگایە) و فەلسەفە و سۆسیۆلۆژی و زانستی ئەدەبی خوێندووە. لێکۆڵینەوەیەکی فراوانی سەبارەت بە فیختەی فەیلەسوف نووسیوە. ئەمڕۆکە نووسەرە و لەگەڵ هاوسەرەکەیدا لە شاری فرانکفۆرتدا دەژی. چەندین کتێبی فەلسەفی تایبەت بە خوێندنی نووسیوە و لەسەرو ئەوانەشەوە تا ئێستاکە کۆمەڵێک شیعر و ڕۆمانی بڵاوکردۆتەوە.